**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ژوورێك بۆ خۆت**
- نووسینی: ڤیرجینیا وۆلف
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: نەشمیل کرمانج
- نەخشەسازی ناوەوە: جێگرعەبدولجەبار
- بەرگ: چیمەن
- ژمارەی سپاردن: (٦١٨) ساڵی (٢٠١٢)
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپی یەکەم: ٢٠١٢
- تیراژ: ٧٥٠
- چاپخانە: هێڤی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٦٦٢)



**ماڵپەڕ**: www.mukiryani.com

**ئیمەیل**: info@mukiryani.com

# پێرست

## کورتە پێشەکیەك

پێشەکی وەرگێڕی فارس سەبارەت بە کتێبەکە پێناسەیەکی پوخت و پاراوی کتێبەکەیە. من دەبێ هەر ئەوندە بڵێم کە چون ئەم کتێبە وەرگێڕانێکە لە زمانی دووهەمەوە بێ کەم و کوڕی نابێ، بەڵام جگە لە پشت ئەستوور بوونم بە وەرگێڕدراوە باشەکەی، ئەو شتەی کە منی زۆر هاندا بۆ ئەم کارە بەتاڵ بوونی قەفەسەی کتێبخانەکانی کوردەوارییە لەم چەشنە کتێبانە و پێداویستی پڕ کردنەوەکەیان. ئەم کتێبەی بەر دەست جگە لەوەی کە هێشتاش یەکێکە لە باشترین سەرچاوەکانی ڕەخنەی فێمینیستی، بابەتەکەشی زۆر لەگەڵ کۆمەڵگەی ئێستای ئێمە یەك دەگرێتەوە. ئەو وێکچوونە دەتوانم بڵێم لە دوو خاڵی سەرەکیدایە ئەویش ئەمەی کە خاتوو ڤیرجینیا وۆڵف هاوکات لەگەڵ ئەوەی بارودوخی نالەباری ئیش کردنی ژنان دەخاتە بەر باس و ڕەخنەیەکی باش ئاراستەی کومەڵگا دەکات لە هەمبەر دژایەتی کردنیان لەگەڵ ژن، خودی ژنانیش لەم ڕەخنەیە بێ بەش ناکات و بە جۆرێکی تر ئەوانیش دەخاتە بەر تیشکی ڕەخنە. و ئەم بابەتەش بۆکۆمەڵگەی ئێمە هێشتا هەر تازە و بە کەلکە. بۆ وێنە منیش هەر وەك زۆربەی ژنانیتری کۆمەڵگەکەم لە پاش تەواو بوونی ئیشی دەرەوە دەبوو گشت ئەرکەکانی ناوماڵ ڕاپەڕێنم و... جا تۆزە کاتێك بدزم و خەریکی ئەم ئیشە بم و بەردەوام بە دەم ئیش کردنەکەشەوە دڵەڕاوکێی ئەوەم بێ ئایا وەشانگەیەك دەبێ ئەرکی وەشاندنەکەی بگرێتە ئەستۆ یان نا و جێی خۆیەتی کە باسەکە لای ئێمەش ئاوا بورووژێت. ماوەتەوە بڵێم کە دەشیکەمە نیشانەیەك بۆ دەربڕینی خۆشەویستی و حورمەتی خۆم بۆ گشت ئەو خاتوونانەی وا لەم کتێبەدا باسیان کراوە و ئەو هەمووە زەرد وماە وسەخت وئەستەمەی بڕیویانە بۆ وەدیهێنانی ئەورۆکە. بە تایبەت ڕۆحە نەسرەوتووەکەی خاتوو ویرجینیا وۆڵف بەو هیوایەی کە بە شایانی بزانێت.

نەشمیل کرمانج

# ژوورێك بۆ خۆت لە گوتەبێژیەوە هەتا کتێب

(پێشەکیی وەرگێڕە فارسەکە)

«خاتوو ڤیرجینیا وۆڵف ڕۆژی شەممە بیستەمی ئۆکتۆبەر هاتە لامان و لە هۆڵی کۆلێژ سەبارەت بە «ژن و چیرۆك» قسەی بۆ کردین. هۆی ئەوەی کە ڕێژەی ژنانی ڕۆماننووس تا ئێستە کەم بووە بە گشتی دەگەڕێتەوە سەر پێکهاتەی خاو و خێزان . نووسین لە ژووری دانیشتن کارێکی هاسان نەبووە و نییە. ئێستا وا ژنان دەستیان داوەتە قەڵەم و دەنووسن (لە پەناوە)، خانمی وۆڵف بەردەنگەکانی خۆی بو نووسین هان دەدا و داوای لێ کردن نووسراوەکانی خۆیان بنێرن بۆ وەشانگەی هۆگارتا"[1]"وەکو بۆ بڵاو کردنەوە هەڵسەنگێندرێن) نابێ هەوڵ بدەن تاوەك خۆیان لەگەڵ ئەو پێوەرە ئەدەبیە باوانە کە بە گریمانەیەکی زۆر پیاوانەن، بگونجێنن. بەڵکە دەبێ پێوەری دیکە بۆ خۆیان دابین کەن دەبێ زمان نۆژەن بکەنەوە تا ڕەوانتر بێ و توانایی ئەوەی هەبێ کە بە تێڕادیوییەکی زیاترەوە لەکار بکرێت. گوتە بێژیەکی سەرنجڕاکێش و بێ وێنە بوو و زۆر سوپاسی خانمی وۆڵف دەکەین کە تەشریفیان هێنا هەر وەها سوپاس بۆ خانمی ئێستراچی"[2]" کە زەحمەتیان کێشا و ئەرکی بەڕێوەبردنی گوتە بێژیەکەیان وەئەستو گرت."[3]"

«بە سووکی پێم گوتن شەراب بخۆنەوە و ژوورێکیان بو خۆیان هەبێت."[4]"

دەقی گوتەبێژیەکانی خانمی ڤیرجینیا وۆڵف لە دوو کۆلێژی نیوهام و گێرتەن-کە هێندە نەبوو لە کەمبریج بۆ ژنانی خوێندکاریان تەرخان کردبوو-لەبەر دەستدا نییە. بەڵام بە سەرنج دان بەو گوزارشتەی سەرەوە وا یەکێك لە خوێندکارەکان لەم بارەیەوە نووسیویەتی، دەکرێ بەو ئەنجامە

---

1-Hearth

٢-Strachey

٣- لە زمانی S. P. Rosenbaum,Women and Fiction لەم سەرچاوەیەی ژێرەوە:

E. E. Phare(The Student Reporter),Thersites,No. 87. 1928

4-Woolf, Virginia. The Diary of Virginia Woolf. ed. Anne Olivier Bell and Andrew McNellie. 5vol. New York: Harcourt. 1977-1984 .

بگەیت نوتفەی ئەو ئستیدلالەی ڤیرجینیا وۆڵف ماوەیەك دواتر لە کتێبی ژوورێك بو خۆت دا بە تێر و تەسەلی باسی لێکرد هەر لەم گوتەبێژیانەدا بەسترا. خاڵی سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە پێوەندی گوتەبێژیەکان لەگەڵ کتێبی ژوورێك بۆخۆت تاقە بە دەقی گوتەبێژیەکانەوە نەبەستراوەتەوە. لای ڤیرجینیا وۆڵف، هەر بەو جۆرەی کە بۆ خۆی لە سەرەتای کتێبی ژوورێك بۆ خۆتدا وەبیری دەهێنێتەوە، ڕاستەقینە، چیرۆك و حەقیقەت بەردەوام پێکەوە لە ئالوگۆڕدا بوون و بوونی هەر کامەیان بەو دووانەی ترەوە بەند بوو. بۆیە ڕاستەقینەی ئەزموونی ڤیرجینیا وۆڵف لەچاو پێکەوتنەکەی کەمبریجی و دوو کۆلێژی کچانە دەبێتە چیرۆك تا ببێتە ئامرازێکی باشتر و ڕوونتر بۆ بەیانی ئەم حەقیقەتە کە دابەشکردنی ماڵ و سامان و زانست لە نێوان ژن و پیاودا قەت بەقەرا یەك نەبووە و ژنان بەردەوام لەبەر دووچاوەکیدا بوون وهەن.

هەر چۆنێك بیّ پاش ئەم گوتەبێژیانە لە بیستی ئۆکتۆبەری ١٩٢٨ لە کۆلێژی نیوهام و لە٢٦ ئۆکتۆبەری ١٩٢٨ لە کۆلێژی گێرتەن، و بابەتەکەیان-«ژن و چیرۆك»- بەرۆکی وۆڵفیان بەرنەدا و تا کۆتایی ساڵ وتارێك هەر بەم سەردێڕەوە«ژن و چیرۆك» دەنووسیّ و دەینێریّ بۆ گۆڤاری بەناوبانگی فوروم"[٥]"لە نیۆیۆرك. وتارەکە لە مارسی ١٩٢٩ بڵاو دەبێتەوە. هەرچەندە وتاری «ژن و چیرۆك» ئەوندەیش دوور و درێژ نییە کە ببێتە دەقی گوتەبێژی، کەچی لەوانەیە زۆر وەك دەقی گوتەبێژیەکانی وۆڵف بێت. ئەم وتارە بە پێی دابونەریتی کەمبریج بە هەندیّ شتی لێڵ و نادیار بە دەوری سەردێڕەکەوە دەست پێدەکات. ڕابردوو، ئێستا و داهاتووی ژن و چیرۆك بە کورتی دەخاتە بەر باس و پیایدا دەچێتەوە و لەم نێوانەدا وۆڵف چوارچێوەی ڕەخنەی ئەدەبیاتی ژنان بە خێرایی دەهێنێتە گۆڕیّ.

وۆڵف سیّ مانگان بو پێداچوونەوە و چاککردنی نووسراوەکانی دادەنیّ و لەم نێوانەدا نێوی کتێبەکە لە «ژن و چیرۆك»ـەوە بۆ «ژوورێك بۆ خۆت» دەگۆڕێت و دەسپێکێکی تازە بۆ کتێبەکە دەنووسیّ. ژوورێك بۆ خۆت سەرئەنجام لە ٢١ ئۆکتۆبەری ١٩٢٩، یەك ساڵ پاش گوتەبێژیەکانی، بڵاو دەبێتەوە."[٦]"

سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٩، وۆڵف پاش سەفەرێکی کورت بۆ بێرلین بە نەخۆشی لە جێدا دەکەوێت و تا شەش حەوتوو ناتوانیّ هیچ بنووسیّ. لە دەفتەرچەی بیرەوەریەکانیڕا وادیارە کە بە

5-Forum

Rosenbaum,S. P. ed. Virginia Woolf/ Woman&Fiction: The Manuscript Versions of A Room Of One s Own. Blackwell Publisher s, 1992 .

هیوایە دەست بکات بە نووسینی ڕۆمانی شەپۆلەکان"[٧]"، بەڵام بابەتی «ژن و چیرۆك» پاش تێپەڕینی چوار مانگ بەسەر گوتەبێژیەکەیدا و سێ مانگ بەسەر نووسینی وتارەکەی هەر بەرۆکی بەرنادا و ئیتر بەم ئاکامە دەگات کە دەبێ بە شکڵ و شێوازێکی نوێوە-«نیوە سەرزارەکی و نیوە دمەتەقێی دەروونی»دیسان بینووسێتەوە."[٨]"

کتێبەکە لەسەر جێگەی نەخۆشی لە زەینی وۆڵفدا بیچم دەگرێت و هەر کە دەتوانێت قەڵەم لەسەر قاقەز دانێ، خێرا لە ماوەی مانگێکدا دەنووسرێ. «وەها خێرا خێرا دەمنووسی کە کاتێ قەڵەمم بەدەستەوە دەگرت لە بتڵێکی ئاو دەچووم کە سەراوبن کرابێ. بەو پەڕی خێراییەکەوە کە دەمتوانی دەمنووسی لەڕادەبەدەر خێرا، چون ئێستا دەبێ خۆم بۆ چاککردنی ئەو نووسراوانە زەحمەت بدەم بەڵام ئەم شێوازە ئازادی دەدا بە مرۆڤ و ئیجازە دەدات لە بیرۆکەیەکەوە باز بدەیە سەر بیرۆکەیەکی تر."[٩]"

هەرچەندە وتاری «ژن و چیرۆك» و کتێبی ژوورێك بۆخۆت لەسەر بابەتێك دەدوێن و بە ئاکامێکی وەك یەك دەگەن، جیاوازی زۆریشیان بەیەکەوە هەیە. بێجگە لەم خاڵە ڕوونە ئەو شتەی لە کتێبدا پەرەی دەدرێتێ لە وتارێکدا بۆت دەست نادا، جیاوازی سەرەکی ئەم دوو نووسراوەیە لە لق و پۆپ دانی بابەتەکەدا نییە، بەڵکو لەو کەشەدایە وا دوو بگێڕەوە لە دوو تێڕوانین جیاوە سازی دەکەن. تێڕوانینی یەکەم تێڕوانینی وتارنووسێکی بەند بە نەریت، شێلگیر و ئاکادێمیکە وا باسەکەی خۆی بە بەکار هێنانی شێوازی ئیستدلالی و هۆهێنانەوەی باو دەست پێدەکات. هۆ و بەڵگە دەدا بە دەستەوە، و پاڵ دەدا بە ڕاستەقینەکانەوە و ئاکامی لێ وەردەگرێت. تێڕوانینی دوهەم، وا تێڕوانینی کتێبی ژوورێك بۆ خۆتە، تێڕوانینی وتار نووسێکی داهێنەر، نوێخواز و خوازیاری گەمە و تەوسە کە بە هەزار تانە و تەوس و تەڵەکەوە گەمە بە نەریت دەکات، و بەردەنگ دەکاتە هاوکاری خۆی، و ڕاستەقینە تێکەڵ بە خەیاڵ دەکات تا هۆهێنانەوەکەی خۆی بە باشترین شێوازێك کە بۆی دەلوێ بخاتە ڕوو.

تۆژینەوەی ژوورێك بۆ خۆت لە ژانری ئەدەبی وتاردا لە بایەخەکەی وەك دەقێکی فێمینیستی کەم ناکاتەوە بەڵکۆ بە پێچەوانەوە، وە بیری دەخاتەوە وا سەرکەوتوویی ئەم نووسراوەیە، بە سەرنج دان بە بابەتی زۆر هەستیار و باس ورووژێنی جینسیەت بە تایبەتی لە سەرەتاکانی سەدەی

---

7-The Waves

8-The Diary of Virginia Woolf,Vol 3. P 221 .

9-Ibid. P 218-19,221-22

بیستەمدا، پیشاندەری لێزانی نووسەرێکە وا دەتوانێ سنووره دیاریکراو و سەقامگیرەکان تێك بشکێنێ و بنەماکانی نووسین سەر لە نوێ بەرامبەر لەگەڵ مەبەستەکانی خۆی دابڕێژێتەوە.

«ژن و چیرۆك»، ئەو وتارەی وۆلف بۆ فورومی دەنووسێ، بەشێکی گەورەی چوارچێوەی کتێبی ژوورێك بۆخۆت دەگرێتە خۆ: گومناوی ژنان، مێژووی ئەدەبیاتی ژنان، کاردانەوەی شێواز و بایەخەکانی پیاوانە لە نووسراوەکانی ژناندا، ڕق و نەفرەت و مەترسیەکانی بۆ هونەرمەند، تۆژینەوەی ڕۆمان وەك ژانری سەرەکی نڤیساری ژنان، پێش بینی داهاتووی ژن و چیرۆك بە لەبەر چاوگرتنی ئازادیە تازە وەدەست هێنراوەکانی ژنان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، جەخت کردنەوە لەسەر لایەنی مادی ژیان و کاریگەرییەکەی لەسەر نووسەرایەتی ژنان، و لەئاکامدا هیوا خواستنی سەرهەڵدانی چیرۆکێکی شێعرئاسا و شێوازێك کە خۆی نزیك کاتەوە لە نڤیساری ژنان. وۆڵف لە ژوورێك بۆ خۆتدا لەباری بابەتەوە هەر تاقە چەند خاڵی گرینگ –بارودۆخی ژنان لە ئاکسبریج و بەراوردکردنی لەگەڵ بارودخی پیاوان، تووڕەیی پیاوان، زەینییەتی دوو جنسی– دەخاتە سەر وتاری سەرەتایی.

بەڵام وتاری «ژن و چیروك» لە ڕووی ڕێنووسەوە پێوەندیەکی زۆر کەمی لەگەڵ ژوورێك بۆ خۆت هەیە. ئێستەکە کە وۆڵف، پاش پەیڤینی دوو گوتە بێژی و نووسینی وتارێك، چوارچێوەی هۆهێنانەوەکەی خۆی دیوەتەوە، و تا ڕادەیەکیش پەروەراندوویەتی، دەتوانێ سەرنجی خۆی بە شێوەیەکی گشتی بخاتە سەر ڕێنووس. چلۆن دەکرێ ئیستدلالێکی زۆر ناخۆش لە قالبێکی وادا بەیان کەیت کە هەر نەك زۆر دڵ نەهێشێنێت، بەڵکە خۆش و سەرنجڕاکێش و جۆراوجۆریش بێت و بتوانێ بەردەنگێکی زۆریش گیرۆدەی خۆی بکات؟ وەڵامدانەوەی وۆڵف بە سەراوژێرکردنی ژانری وتار و وتارنووسی دەبێتە هۆی ئەوەی کە کتێبەکە بە بەڵام دەسپێبکات، واتە لە ناوەڕاستی باسەکەوە، و بابەتەکە لە ڕوانگەی خوێنەر و لێکۆڵینەوەی ئەوەوە دەس پێدەکات و بە واتایەکی خوێنەر دەخاتە لاسەرووی خۆیەوە. لە جیات وەی کە لە لێڵی بابەتەکە کەم کاتەوە، پێی زیاد دەکات. گەمە دەکات بە متمانەی نەریتی وتارنووسین، وا لەسەردەمی وۆڵفدا تەواو پیاوانە بوو، و متمانەکەی خۆی بە خاکەڕایی و زیرەکیەوە لەسەر بناغەی ئەزموون و زانست و ئێحساساتە تاکە کان دادەمەزرێنێ. بگێڕەوەیەك خەلق دەکات جگە لە نووسەر، و لە هەمان کاتیشدا شاراوە و بێ ناو ونیشان، کە بتوانێ بە ئاسانی لەگەڵ بەردەنگی خۆی پێوەندی ساز بکات و لە هاودەردەکەی خۆی هاوڕێیەکی نزیك ساز بکات و لە نامۆیەك دڵسۆز و خەمخۆر. پێشتر بە تەوس و تانە و زەمەکانی بگێڕەوە جوان ئاوی گوێ ئەو کەسانەی داداوە وا بیانەوێت ڕاشکاوانە دوژمنایەتی و

دژایەتی ژنان بکەن. ڕاستەقینە دەخاتە بەر باس، بەڵام تێکەڵاوی خەیاڵ و چیرۆك وتنەوە. حەقیقەت دەڵێ، بەڵام لە قەبارەیەکی چیرۆکاوی و ڕەواندا وا بە سانایی بۆ پۆلین بەندی و وەرنەگرتن و قەبووڵ کردن نابێ کەلك لە زمانێکی سەرزارەکی وەردەگرێت و زنجیرەی بیرۆکەکانی بگێڕەوە بە گشت وەبیرهاتنەوە و بێدەنگی و لێکهەڵوەشاندنەوە و دیسان دەسپێکردنەوەکانەوە دەگێڕێتەوە تاوەکی بەردەنگەکە لەگەڵ وی، کە دەڵێی زۆر دۆستانە دەردی دڵی لەگەڵ دەکات، بکاتە هاوڕێ.

گرنگایەتی ستراتیژی نووسینەوەی ژوورێك بۆ خۆت دەگاتە ئەو جێیەی کە ئەم کتێبە هێشتاش لە پۆلەکانی ڕێنووس، ڕێوشوێنی بەیان لە ئاستە جیاجیاکانی زانکۆدا دەگوترێتەوە. بەڵام لەوە گرینگتر بایەخی ئەم کتێبە لە دانانی شێوازێکی نوێی وتار نووسیندایە. لە نێو نووسەرانی مۆدێرنی ئینگلیسی زماندا، تاقە وۆڵفە وا تایبەتمەندیەکانی پەخشانی مۆدێرنیستی لە وتار نووسیندا ئەزموون دەکات. وتار نووسی مۆدێرنیست ئیتر هەر تاقە پەرۆشی بەدەستەوە دانی هۆ و بەڵگەی تەواو و باوەڕپێکراو بە پاڵپشتی حەقیقەتێکی تاك و بەرچاو نییە، بەڵکو پتر خەریکی پیشاندانی پێوەندی پێچەڵاوپێچی منی«چیرۆك»ی ناو دەق لەگەڵ بەردەنگ و بابەتە بۆ دەربڕینی حەقیقەتە لەناویەکەکاندا. ئەم ستراتیژیە زۆر نوێ و زێدەڕویە دەسەڵات و متمانەی «من»ی نەریتی زانا و زانستمەند تەواو دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، پەخشانەکە لەدەس قاڵبێکی ویشك و یەك لایەنە ڕزگار دەکات و هەلی ڕەوانی و جم و جۆڵی چیرۆکی بۆ دەرەخسێنێ.

بەڵام لایەنی شۆڕشگێڕانەی ژوورێك بۆ خۆت تاقە لە ڕێنووس و پەخشانە مۆدێرنەکەیدا کۆ نابێتەوە. وۆڵف لە ژوورێك بۆ خۆتدا خۆی داهێنەری بیرۆکەیەکی فێمینیستیە، بیرۆکەیەك وا تەوەرە سەرەکیەکەی ژن و فەرق و جودایەتی جینسیە و باسی هەبوونەکەی لە گشت زانستی مرۆڤ، و بە تایبەت لە ئەدەبیاتدا دەکات. پێوەندی وۆڵف و ژوورێك بو خۆت لەگەڵ تێڕوانین و بزاڤی فێمینیسم لە چیدایە؟ ئەم پێوەندیە چلۆن بیچم دەگرێت و بە کوێ دەگات؟

وشەی فێمینیست یەکەم جار لە ٢٧ ئاوریلی ١٨٩٥ لە گۆڤاری ئاتێنیوم لە لێکۆڵینەوەی کتێبێکدا هاتە گۆڕێ، بۆ پێناسەکردنی ژنێك«وا توانایی شەڕکردنی بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی هەیە»ساڵی ١٨٩٥ سەردەمی بە لووتکە گەیشتنی خەباتی ژنانی ئەوروپایی و ئامریکایی بۆ وەرگرتنی مافی دەنگدانە و غیرەت و پڕکێشی ژنانی چالاك لەم خەباتەدا -وا هیچ لە مان گرتن و خۆ وەبەر تەگەردانی کالیسکەی سیاسەتوانان و لە بەندیخانە کران نەدەترسان-ترسی لە دڵی خەڵکی ڕەشوکی خستبوو. لە ئاکامدا، وشەی فێمینیست لەسەرەتای سەرهەڵدانی لە ناو قامووسدا، بزووتنەوەیەکی زێدەڕۆیانە، دژە نەریت و ئاژاوە گێڕی دەخستەوە یاد و لە ئەنجامدا ئەو

ژنانەی بەم بزووتنەوەیە و ئەم وشەیەوە دەناسران و دەستبەجێ دەکەوتنە ناو کەمایەتیەکی شەرمەزارکراوەوە.

ڤیرجینیا وۆڵف لەو سەردەمەدا، یانی سەردەمی سەرهەڵدانی وشەی فێمینیست، سێزدە ساڵان بوو. لە ساڵی ١٩١٨، کە ژنانی ئینگلیسی ئاخری بوونە خاوەنی مافی دەنگدان، ڤیرجینیا وۆڵف ٣٦ ساڵی بوو. و لە ساڵی ١٩٣٠، یانی یەك ساڵ پاش بڵاوبوونەوەی ژوورێك بو خۆت، کە ئیتر ژنانی ئینگلیسی بە گشتی مافی کارکردنیان پێدرا، وۆڵف ژنێکی ٤٨ ساڵان بوو. ئەگەر هیچ کام لە ئەندامانی بنەماڵەی وۆڵف ڕاستەوخۆ لە بزووتنەوەکانی فێمینیستیدا بەشدار نەبوون، یەکەمایەتی پرسی ژن لە پێوەندی لەگەڵ مافی دەنگدان، مافی خوێندن لە زانکۆ و مافی کارکردن هەم یەکەمایەتی زەمانەی وۆڵف بوو و هەمیش یەکەمایەتیەکی تاکە کەسی.

ڤیرجینیا وۆڵف لە لایەکەوە لە بنەماڵەیەکی تەواو باوك سالاردا لە دایك ببوو وا باوەڕیان بە دانە دانەی کلیشە جنسیەکانی سەردەمی ویکتۆریای ئینگلیستان بوو و، لە لایەکی ترەوە، بنەماڵەکەی خاوەنی ئیمتیازەکانی چینی دەوڵەمەندی خوێندەوار بوون وا پانتاییەکەی، چ ڕاستەوخو و چ ناڕاستەوخۆ کچەکانیشی دەگرتە خۆ. بۆ وێنە وۆڵف، هەر چەندە نەدەچووە فێرگە (ئەم ئیمتیازە تایبەتی کوڕەکانی بنەماڵە بوو) دەیتوانی لە ژێر چاوەدێری دایك و بابی خۆیدا بخوێنێت و پاشان بە کەڵکوەرگرتنی لە کتێبخانەی تاکە کەسی بابی (لێسلی ئێستیڤەن)، (ڕەخنەگر و مێژوونووس) و مامۆستا تایبەتیەکان درێژە بەخوێندنەکانی خۆی بدات. بەڵام چاوەڕوانی بنەماڵە لە ڤیرجینیا و خوشکەکەی، وەکی چاوەڕوانی کۆمەڵگا لە گشت کچانی نەجیبزادە و خوێندەوار، ئەمە بوو کە لە پاش ئەوەی کە کەوتنە ناو کۆمەڵگەی دەوڵەمەندان و ئەشرافەکانەوە شوویەکی باش بکەن و بەرپرسایەتی هاوسەری و دایکایەتی بگرنە ئەستۆ.

ڕۆحیەی بیرمەند و هەستیاری وۆڵف هەر لە ساڵەکانی سەرەتای ژیانییەوە دژ بەم نموونانە بوو. وۆڵف لە لاویەتیەوە خولیای نووسەر بوونی لە مێشکدا بوو و هەر بۆیە بە دووی سەربەخۆیی ماڵی و مەعنەویەوە بوو. بەڵام چونکە ڤیرجینیا کچێکی خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕ نەبوو، سەربەخۆییە بەرەبەرەکەی وەك ژنێکی نووسەر و بیرمەند قەرزداری هەندێ هۆی پێش بینی نەکراو بوو.

ڤیرجینیا لە ٢٢ ساڵیدا، پاش مەرگی بابی لێسلی ئێستیڤەن و ڕەخسانی هەلی هەڵاتن لە بن دەستی دایك براکەی جۆرج داك وورت وا دەیخستە بەر دەسدرێژی جنسییەوە، ئازادیەکی بێ وێنە و

تازەی ئەزموون کرد. خوشکانی ئێستیڤەن لە ماڵە نوێیەکەی خۆیانا لە بلومزبێری"[10]"وردە وردە هاوڕێیان و هاوپۆلانی توبی برایان دەناسی و بە ئازادی تا نیوە شەو لەگەڵ ئەم پیاوە گەنج و رووناکبیرانە خەریکی دەمەتەقێ و بیر و ڕا گۆڕینەوە دەبوون. ئەم دانیشتنانە، ئاسەوارێکی گرێبەستە کۆمەڵایەتیە باو و دەسەڵاتدارەکانیان تێدا نەبوو. هێزی تێفکرین و هۆهێنانەوە گرینگایەتیەکی پێتریان دەدرایێ تا سەروسەکوت و داب و نەریتی هەڵس و کەوت و ئاکاری ڕەگەزی گونجاو. جگە لەوە، ڤیرجینیا لە پەنا خوشکەکەی وەنسا و براکەی توبیەوە هەلی چوونە سەفەر و ئەزموونکردنی بۆ رەخسا.

سەربەخۆیی ماڵی ڤیرجینیا لەم سەردەمانەدا، وا هێشتا دەرکەی بازاڕی کار لەسەر ژنان داخرابوو و ئەو نووسەرێکی شێلگیر نەبوو، قەرزداری میراتێك بوو وا نەختە نەختە لە ٢٢ ساڵیەوە تا ٢٧ ساڵی پێی گەیشت: سەرەتا لە ساڵی ١٩٠٤ دا بڕە پارەیەکی کەمی لە بابیەوە پێ بڕا. پاشان لە ساڵی ١٩٠٦ دا میراتێکی باشتری لە لایەن توبی برایەوە پێ بڕا کە لە ناکاو بە نەخۆشی کەوتوویی تێدا چووبوو و ئاخرەکەی میراتەکەی پوری کارولاین ئیمیلیا ئێستیڤەن"[11]" لە ساڵی ١٩٠٩ کە بەسەر هاتی چیرۆکەکەی لە ژوورێك بو خۆتدا دێت.

ڤیرجینیا وۆڵف هەم ئاگادار بوو لە کەندوکۆسپەکانی ڕەگەزی خۆی لە کۆمەڵگەی سەردەمی ویکتۆریا و هەمیش لەو ئیمتیازانەی کە چینە کۆمەڵایەتیەکەی و هەم ئەو ڕێکەوتانەی کە ژیان خستبوویە بەر دەستی. ئەم ئاگاداریە لەبەر تیشکی گەشەکردنی ئاگاداری فێمینیستی و بزووتنەوەی ژنان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەرە بەرە لە ڤیرجینیادا زۆرتر پێگەیشت و لە نووسراوە چیرۆك و غەیرە چیرۆکەکانیدا بیچمی گرت. ڤیرجینیا وۆڵف ساڵی١٩١٠، یانی لە ٢٨ ساڵیدا، بۆ ماوەیەکی کورت بە خواستی خۆی لە بزووتنەوەی مافی دەنگدانی ژناندا بزاڤی کرد و تا کۆتایی ژیانی پێوەندی خۆی ڕاگرت لەگەڵ بزووتنەوەی مافی ژنان، کۆلێژەکانی ژنان و کۆڕە جۆراوجۆرەکانی ژنان، کە سەرۆکی زۆربەیان هاوڕێیان و خزم وکەسەکانی بوون،. بەڵام خزمەتی سەرەکی و حاشا هەڵنەگری ئەو بۆ بزووتنەوەی ژنان و فێمینیسم دەگەڕێتەوە بۆدامەزراندنی هۆهێنانەوە، بیرمەندی و تۆژینەوەی فێمینیستی لە کتێبەکانی ژوورێك بۆ خۆت و سێ گینی"[12]"دا.

10-Bloomsbury
11-Caroline Emelia Stephen
12-Three Guineas

هاوكات، وۆڵف له وشه‌ی «فێمینیست»وه‌ك به‌رنووسه‌كێك كه‌ كۆڵێك خراپ لێتێگه‌یشتن و تێنه‌گه‌یشتوویی خوازیار و ناخوازیاری به‌دووه‌وه‌ بوو بێزار بوو و به‌ درێژایی ته‌مه‌نی پێوه‌ندیه‌كی دوو پاڵووی له‌گه‌ڵیان بوو. ئه‌م خراپ تێگه‌یشتن و تێنه‌گه‌یشتنانه‌ هه‌ر هی باوه‌ڕی زاڵ به‌سه‌ر كومه‌ڵگه‌ی دژه‌ ژنی سه‌رده‌مانی ویكتوریاوه‌ نه‌بوو، به‌ڵكه‌ له‌و پێناسه‌ ساویلكه‌ و سنووردارانه‌شه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ی ده‌گرت وا ژنانی چالاك و كچانی خوێنده‌واری سه‌رده‌می وۆڵف باوه‌ڕیان پێی بوو. بۆ زۆرینه‌ی ژنانی ئینگلیسی، وه‌رگرتنی مافی ده‌نگدان له‌ ساڵی ١٩١٨ و وه‌رگرتنی مافی كاركردنی ته‌واو تا كۆتایی ساڵی ١٩٣٠ به‌ واتای كۆتایی فێمینیسم بوو. به‌ڵام ئازادی و سه‌ربه‌خۆیی لای وۆڵف چه‌مكێكی زۆر پێشكه‌وتووتر و پێچه‌ڵاوپێچتر بوو. له‌ ژوورێك بو خۆت و پاشان له‌ سێ گینی دا، وۆڵف پێوه‌ندی ژن به‌ نیزامی باوك سالاره‌وه‌ به‌ شكڵی جۆراوجۆریه‌وه‌ ده‌خاته‌ به‌ر تیشكی ڕه‌خنه‌ و به‌م ئاكامه‌ ده‌گات كه‌ گۆڕانی بنه‌ڕه‌تی و بنه‌مایی ئه‌م پێكهاته‌یه‌ پێداویستی ئازادی و سه‌ربه‌خۆیی ژنه‌. قه‌بووڵكردنی بیركردنه‌وه‌ و لێكدانه‌وه‌یه‌كی ئاوا سه‌باره‌ت به‌ فێمینیسم له‌سه‌رده‌مانی وۆڵف زۆر ئه‌سته‌م بوو-و چما له‌سه‌رده‌مانی مه‌شدا هێشتا ئه‌سته‌م بێ.

نووسینی ژوورێك بۆ خۆت له‌ ٤٧ ساڵیدا، و سێ گینی له‌ ٥٨ ساڵیدا -ئه‌و كاته‌ی وۆڵف ئیتر نووسه‌رێكی به‌ ناوبانگ بوو و فرۆشتنی كتێبه‌كانی قازانجێكی زۆری پێوه‌ بوو-پێشانده‌ری باوه‌ڕی پته‌وی ئه‌وه‌ به‌ تێڕوانینی فێمینیستی و ئازایه‌تی ئه‌و له‌هه‌مبه‌ر ده‌ریایه‌ك ڕه‌خنه‌ و تێنه‌گه‌یشتویی وا بڵاوكردنه‌وه‌ی ئه‌م دوو كتێبه‌ی لێكه‌وته‌وه‌. وۆڵف كاردانه‌وه‌ی ژوورێك بۆ خۆت به‌ تیژ بینییه‌وه‌ ئاوه‌ها پێش بینی ده‌كات: «وه‌ك فێمینیستێك هێرشم ده‌كه‌نه‌ سه‌ر و به‌ هێماوه‌ پێم ده‌ڵێن هاو جنس باز. ده‌ترسم پێیان شێلگیرانه‌ نه‌بێ... له‌به‌ر خۆمه‌وه‌ ده‌ڵێم گرینگ نییه‌، قه‌یناكا. به‌ڵام من ئه‌وم به‌ عیشق و باوه‌ڕه‌وه‌ نووسی...»[١٣]

ژوورێك بۆ خۆت سه‌ره‌تای ڕه‌وتێكی فیكری زۆر شۆڕشگێڕانه‌یه‌ كه‌ به‌ شێوه‌یه‌كی گشتی بیرۆكه‌ دانانی فێمینیسم و به‌ تایبه‌تی لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌ده‌بی فێمینیسم بیچم ده‌دات. هه‌رچه‌نده‌ پرسی ژن و بێ به‌شیه‌ تاكه‌ كه‌سی و كۆمه‌ڵایه‌تیه‌كانی به‌ر له‌ وۆڵف و له‌ سه‌ده‌هایه‌كی دوور و درێژدا دێته‌ گۆڕێ، وۆڵف یه‌كه‌م كه‌سه‌ وا له‌ ده‌س كورتی و كێشه‌كانی ژنان له‌ هه‌مبه‌ر گوتاری زاڵ و گریمانه‌كان ده‌كۆڵێته‌وه‌. وۆڵف و ژوورێك بۆ خۆت قۆناغێكی نوێی فێمینیسم ده‌ست پێده‌كه‌ن. له‌

---

13-Woolf, Virginia. A Writetrs Diary, ed. Leonard Woolf. New York: Harcourt Brace Jovanovich. 1953 .

قۆناغی یەکەمی فێمینیسمدا، مێری وۆلستۆن کرافت"[١٤]"، نووسەری کتێبی وەرگرتنی مافەکانی ژن"[١٥]"، و ژنانی پارێزەری مافەکانی ژن بەر لە وۆلف وە پاشان دەرفەتی خوێندن، خاوەنایەتی، و هەبوونی مافی دەنگدان و زۆریەك لە دەرفەتە کۆمەڵایەتی و تاکەکانی تر بۆ ژنان دابین دەکەن. لە قۆناغی دوهەمدا، ئافرا بێن"[١٦]"، مێری وۆلستۆن کرافت شێلی، خوشکانی برۆنتیێ، جین ئاستەن، جۆرج ئیلیۆت و نووسەران و وەرگێڕانی ژنی سەدەکانی حەڤدە، هەژدە و نۆزدە نەك هەر ژن وەك نووسەرێکی لێهاتوو دەهێننە ناو دونیای ئەدەبیاتەوە-ژنێك کە لە هەمبەر نووسیندا دەبێتە خاوەنی نەختە داهاتێك-بەڵکو ڕوانگەی ژن و بایەخە جیاوازەکانی لە ناو نووسراوە و چیرۆکەکانی خۆیاندا تۆمار دەکەن. لە قۆناغی سێهەمدا، وۆلف، و تۆزێ دواتر دوبڤار، شۆڕشێك دەست پێدەکەن وا ژنانی بیرمەند، لێکۆڵەر و بیرۆکە داهێن پاش ئەو دووانە دەیگەیەننە بەر. ئەم شۆڕشە، وا لێکۆڵینەوەی فێمینیستی ناوە، لێکدانەوە و ناسینی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بزاڤی ژنە وەك ڕەوتێکی فیکری جێکەوتوو بە دژایەتیکردنی گوتاری زاڵی پیاو ناوەند، و پیشاندەری هەبوونی لەبەر چاو نەگیراوی ژن و بیر وڕای شاراوەو سڕدراویەتی کە بە ناچار متمانەی گشت زانستی پیاو ناوەند دەخاتە ژێر پرسیارەوە. تۆژینەوەی فێمینیستی وردە وردە لە ناو هەموو بوارەکانی زانستەوە ڕۆدەچێ و خەریکی پێداچوونەوە و نووسینەوەی دووبارەی بوارە جۆراوجۆرەکانی زانست دەبێ تا کەشێك بۆ ژن و ڕوانگەکەی ساز بکات. ئەم سێ قۆناغەش هەم لە ڕەوتێکی هێڵیدا یەك لە دوای یەك ساز بوون، و هەم لە سەردەمانی جیا جیادا، بە تایبەتی لەسەدەی بیستەمدا، پێکەوە و لە پەنا یەکتری گەشەیان کردووە.

پێوەندی وۆلف و بەتایبەت کتێبەکەی، ژوورێك بۆ خۆت، لەگەڵ ڕەخنەی فێمینیستی پێوەندیەکی تەواو دووقولیە. بە واتایەکی تر، وۆلف لە لایەکەوە ڕەخنەی فێمینیستی پێناسە دەکات و بیچمی پێدەدات و لە لایەکیترەوە، ڕەخنەی فێمینیستی وۆلف وەك نووسەرێکی فێمینیست سەر لە نوێ پێناسە دەکات و لە پێگەیەکی زۆر بەرز و باوەڕپێکراوی دادەنێ.

هاتنە گۆڕێی ڕەخنەی فێمینیستی وەك ڕوانگەیەکی جێکەوتوو و ئاکادێمیك لە دەیەی ١٩٧٠ لە ئامریکا هاوکات دەبێ لەگەڵ هاتنە گۆڕێی وۆلف و بەتایبەت ژوورێك بۆ خۆت. ئەستەمە بکرێ ڕەخنەیەکی فێمینیستی لەو سەردەمەدا ببینییەوە کە قسەیەکی ژوورێك بۆ خۆتی تێدا

---

14-Mary Wollstone Craft
15-Vindication of the Rights of Women
16-Aphra Behn

نەبێ. بەڵام لە نێو لێکۆڵەرانی فێمینیست ئێلین شوالتەر بە بڵاوکردنەوەی کتێبی ئەدەبیاتێك بۆ خۆیان"[17]" لە ١٩٧٧دا، ساندرا گیلبێرت و سوزان گابەر بە بڵاو کردنەوەی کتێبی ژنی شێت لە ژووری ژێر شیروانی"[18]" لە ١٩٧٩، و جین مارکوس بە بڵاو کردنەوەی کۆمەڵە وتاری فێمینیستی تازە سەبارەت بە ڤیرجینیا وۆڵف"[19]" لە ١٩٨١دا دەورێکی گرینگیان لە ناساندن و پێداچوونەوەی ڕاکانی وۆڵف دا هەبووە. بەم حاڵەشەوە، پێوەندی وۆڵف لەگەڵ ڕەخنەی فێمینیستی پێوەندیەکی پڕ لە هەوراز و نشێو بووە. لە لایەکەوە، چوار چێوەی سەرەکی ڕەخنەی فێمینیستی تا ڕادەیەکی زۆر قەرزداری وۆڵف و ژوورێك بۆ خۆتە و، لە لایەکیترەوە، بەبێچم گرتنی ڕەخنەی فێمینیستی تێفکرین و هۆهێنانەوەی دانەری بەرهەمەکەش دەکەوێتە بەر تیشکی ڕەخنە. بەگشتی ڕەخنەی فێمینیستی دەیەی ١٩٧٠ دوو کێشەی بنەڕەتی لە وۆڵف و ژوورێك بۆ خۆتدا پێناسە دەکات. یەکەمیان ئەوەی کە وۆڵف لە چینی دەوڵەمەند و رووناکبیرو لە ئاکامدا ناوازەخوازە. بە واتایەکیتر، وۆڵف سەرنج ناداتە عامەی ژنان و سەرنجەکەی هەر لەسەر ژنانی دەگمەن و هەڵکەوتە، ژنی نووسەر و ژنی هونەرمەندە. و دووهەم ئەوەی کە بەشی شەشەمی کتێبی وۆڵف، وا تیایدا باسی چەمکی دوو جنسی بوونی هونەرمەند دەکات و وێنەی ژن و پیاوێك وینا دەکات وا بەیەکەوە سواری تاکسی دەبن، بەشەکانی پێشووتر، وا تیایاندا جەخت لەسەر جیاوازیی ژن و نامۆییەکەی لەگەڵ سیستەمی زاڵە بەتاڵ دەکاتەوە.

لەم نێوانەدا، جین مارکوس تاقە لێکۆلەرێکە وا لەسەرەتاوە پێداگری لە بایەخی وۆڵف لە ڕەخنەی فێمینیستیدا دەکات. بە ڕای ئەو، « ژوورێك بۆ خۆت یەکەم دەقی مۆدێرنی ڕەخنەی فێمینیستیە نموونەیەکی هەم تیئۆری و هەم پراکتیکی لە ڕەخنەی فێمینیستی سوسیالیستی."[20]"مارکوس لە جیاتی وۆڵفی بەرنووسەکاوی، نیمچە ئەشرافی، مەجنون، بەدەمار و بێ ئاگا لە ڕاستەقینەی بلۆمزبێری- ئەو وێنەیەی وا ژیاننامە نووسی ڕەسمی

17-Showalter,Elaina. A Literature of Their Own. Princeton University Press,1977

18-Gilbert,Sandra and Susan Gubar. The Madwoman in the Attic: The Woman Writer and the Nineteenth Century Literary Imagin ation. New Haven: Yale University Press,1979

19-Marcus,Jane,ed. New Feminist Essaye On Virginia Woolf. Lincoln: University of Nebraska Press,1981

20-Marcus ,Jane. "Still Practice. A Wrestled Alphabet: Toward a Feminist Aesthetic. " Tulsa Studies in Womens Literature,3. 1-2(1984): 79-97 .

وۆلف، واته خوشکەزاکەی کوینتین بێل"[٢١]"، وینای دەکات-وۆلفێکی سیاسی، لاسار و خۆڕاگر، و خەباتگێڕ پێناسە دەکات کە تەواو زاڵە بەسەر ڕیو شوێنی بەیان و ئەدەبیاتی سەردەمی خۆیدا و نەك هەر شۆڕشێك لە تێڕوانینی ڕەخنەییدا دەخاتە گەڕ، بەڵکە دەورێکی گەورەی لە بزاڤی ئەدەبیاتی مۆدێرنیستدا هەیە. مارکوس دەڵێ دژبەیەکەکانی ژوورێك بۆ خۆت لە سەرنج پێنەدانی خوێنەران بە تەوس، وردەکاری زمانی و ڕێوشوێنەکانی بەیانەوە سەرچاوە دەگرێت و بە جەختکردنەوەی لەسەر ئاگاداری وۆلف بە چینی کۆمەلایەتی و کاریگەرییەکەی لەسەر گەشەکردنی تاك، تۆمەتی ناوازەخوازی لەسەر لادەبات.

لە دەیەکانی١٩٨٠ و ١٩٩٠دا، کتێب و وتارگەلی جۆراوجۆر سەبارەت بە وۆلف و پێوەندیەکەی لەگەڵ مۆدێرنیسم، پۆست مۆدێرنیسم و فێمینیسم نووسرا کە هەم نەختە نەختە وێنەیەکی هاوتەرازتر و ڕاست بینانەتریان لە وۆلف خستە ڕوو، و هەمیش گرینگایەتی شێواز و ڕوانگەی وۆلفیان لە ئەدەبیات و ڕەخنەی فێمینیستیدا سەقامگیر کرد. لە ساڵی ١٩٩٢دا، بەت بویێهم لە وتاری «ڕاستەقینە، چیرۆك و لەوبەری چیرۆکەوە»"[٢٢]"دەنووسێ، سەیر نییە کە ٦٢ ساڵ پاش بلاو بوونەوەی کتێبی ژوورێك بۆ خۆت قەفەسە بەتاڵەکانی وۆلف پڕ بوون لە کتێبی ژنان. بەلام زۆر جێگەی سەرسووڕمانە کە ژوورێك بۆ خۆت هێشتاش لە ناو قەفەسەی کتێبفرۆشیەکانی زانکۆدایە و بەرهەمەکەی وۆلف لە پۆلە جۆراوجۆر و جیا جیاکانی ئاستە جۆر بە جۆرەکانی زانکۆدا دەگوترێتەوە.

---

21-Bell, Quentin. Virginia Woolf: A Biography. New York: Harcourt Brace Jovanovich. 1972

22-Boehm, Beth A. "Fact,Fiction,and Metafiction: Blurred Gendres in Orlando and A Room of One s Own", Journal of Narrative Technique 22: 3 (1992): 191-204

# بەشی یەکەم

بەڵام لەوانەیە بڵێن ئێمە داوامان لێ کردی باسی شتێکمان سەبارەت بە ژن و چیرۆك بۆ بکەی —ئەمە چ پێوەندییەکی بە ژوورێك بۆ خۆتەوە هەیە؟ هەوڵ دەدەم شی بکەمەوە. کاتێك داواتان لێ کردم سەبارەت بە ژن و چیرۆك بدوێم لە قەراغ چۆمی دانیشتم و کەوتمە بیرکردنەوە لە واتای ئەم وشانە. واتای ئەم وشانە بە تێروانینێکی سانا دەبێتە کورتە باسێك سەبارەت بە فێنی بۆرنی"[٢٣]"، چەند وشەیەك لەبارەی جینی ئاستەن، ڕێزگرتنێك لە خوشکانی برۆنتێ و کورتە باسێ لەمەڕشۆێنی ژیانیان لەهاوورتی"[٢٤]"بەفرداگرتوودا، ئەگەریش بکرێ شتێکی سەرنجڕاکێش سەبارەت بە خاتوو میت فۆرد"[٢٥]"، دەربڕینی ڕایەکی ماقووڵانە لە بارەی جۆرج ئیلیۆت و ئاماژەکردنێك بە خانمی گەسکێل"[٢٦]" و کارەکە دەگاتە کۆتایی. بەڵام بە تێڕوانینێکی تر واتای ئەم وشەگەلە هێندیش ساکار نایەنە بەرچاو. بابەتی ژن و چیرۆك پێدەچێ بە واتای ژن و ساختەچی بوونەکەی بێ — یان لەوانەیە ئێوە بەو واتایە بەکارتان هێنابێت - یان ڕەنگە بە واتای ژن و ئەو چیرۆکەیە دەینوسێ یان ژن و ئەو چیرۆکەی لەبارەیەوە نوسراوە و لەوانەشە هەر سێ ماناکەی بە جۆرێکی سەیر پێکەوە تێکەڵ بووبن و ئێوە لە منتان ویستووە ئاوا پێیاندا بچمەوە. بەڵام کاتێك بیرم لە سێهەمین واتای کردەوە — بە رواڵەت سەرنجڕاکێشترین جۆریەتی-تیٚگەیشتم تاقە ئاکامێکی مەترسیداری بەدووەوە هەیە: ئەویش ئەوەیە کە قەت ناتوانم بە ئاکامێك بگەم. قەت ناتوانم یەکەمین ئەرکی گوتاربێژێك بەجێ بێنم و پاش کاتژمێرێك قسەکردن، دەنکێ حەقیقەتی ڕوتتان بخەمە بەردەست تا بیخەنە ناو لاپەڕەی دەفتەرەکانتانەوە و بۆ هەتاهەتا لە سەر تاقە هەڵیگرن. ئەو شتەی کە لە دەستم دەهات ئەوە بوو کە ڕای خۆم سەبارەت بە خاڵێکی بچوك دەربڕم-ژنێك وا دەیهەوێ چیرۆك بنووسێ دەبێ پوولێك و ژوورێکی بۆخۆی هەبێ ئەم کارەش بەو جۆرەی کە پاشان دەیبینن کێشە گەورەکەی ماهیەتی ژن و ماهیەتی ڕاستەقینەی چیرۆك هەروا بێ چارەسەر دەهێڵێتەوە. من ئەرکی بە ئاکام

---

23-Fanny Burney
24-Haworth
25-Miss Mitford
26-Mrs. Gaskell

گەیشتنم لەم پرسەدا بەجێ نەهێناوە-ژن وچیرۆك هێندەی پێوەندی بەمنەوە هەبێ کێشەگەلێکن بەبێ چارەسەردەمێننەوە. بەڵام بۆ قەرەبوو کردنەوەی هەوڵ دەدەم بۆتان روون کەمەوە چۆناوچۆن بەم ڕایە گەیشتم سەبارەت بە پووڵ و ژوور. هەوڵ دەدەم ئەوندەی بۆم بلوێ لای خۆتان ئەو فیکر و خەیاڵانە بە تێروتەسەلی و بەوپەری ئازادیەوە شی بکەمەوە وا منیان گەیاندە ئەم ڕایە. رەنگە ئەگەر ئەو بیروڕا و دەمارگرژییانەی وا لە پشت ئەم بیرۆکەیەدان روون کەمەوە، تێ بگەن کەوا بە جۆرێك لەگەڵ ژن و بە جۆرێکیش لەگەڵ چیرۆك پێوەندیان هەیە. هەرچۆنێکە ئەو کاتەی بابەتەکە باسووروژێنە -وەك گشت بابەتە پێوەندیدارەکان بە جنسیەتەوە- نابێ بەهیوای گوتنی حەقیقەت بی هەر ئەوەندە نەبێ کە روونی کەیتەوە چ شتێك بووەتە هۆی ئەوەی ئەم بیرۆکەیە بیچم بگرێت. هەر دەتوانی ئەو هەلە بۆ بەردەنگەکانت بڕەخسێنی کە، بە لەبەر چاوگرتنی سنوورەکان و تەعەسوبەکان و تایبەتمەندییەکانی تاکەکەسی گوتاربێژ، بۆخۆیان بگەن بە ئاکام. لێرەدا چیرۆك باشتر لە راستەقینە دەرەقەتی بەیانکردنی حەقیقەت دێت. کەواتە، بەدەستەودامێن بوونی گشت ئازادی و ئیختیارەکانی رۆمان نووسێك، دەمهەوێ چیرۆکی دوو رۆژ بەرلە هاتنم بۆ ئێرەتان بۆ بگێڕمەوە ئەوەی کە وا چۆن شانم دا بەر ئەو ئەرکەی پێتان سپاردووم چۆن کەوتمە بیر لێ کردنەوەی و چلۆن لە ژیانی ڕۆژانەمدا لەگەڵی جینگلّم دا. پێویست ناکا بڵێم ئەوشتەی شی دەکەمەوە بوونێکی دەرەکی نییە ئاکسبریج"[٢٧]" ناوێکی نێو چیرۆکە، فرێنهام"[٢٨]"یش هەروەتر «من» تاقە وشەیەکی گونجاوە بۆ ئەو کەسەی بوونێکی دەرەکیی نییە. درۆم لەزار دێتە دەر، بەڵام لەوانەشە حەقیقەتگەلێکی تێدابێ ئەوە لەسەر ئێوەیە ئەم راستەقینانە ببیننەوە و بڕیاریان لەسەر بدەن ئایا هیچ کامیان شایانی ئەوەن ڕایگرن یان نا. ئەگەریش بایەخیان نەبوو دەتوانن گشتیان فڕێ دەنە ناو زبڵدانەوە و لەبیریان بەرنەوە. کەواتە من یەك یان دوو حەوتوو لەمەوبەر لە ناو هەوای خۆشی ئۆکتۆبەردا نوقمی ناو فیکر و خەیاڵات ببووم (ناوی مێری بێتون"[٢٩]"، مێری سیتۆن"[٣٠]"، مێری کارمایکێل"[٣١]"، یان هەرنێوێکی دیتان پێ خۆشە لە سەرم دابنێن-ئەم شتە زۆر گرنگ نییە) لە پەنا چۆمی دانیشتبووم. ئەو تەوقە (یان ئەرکە)وا بۆم باسکردن - ژن و چیرۆك- و بەئاکام گەیشتنێکی پێویست لەم پرسەدا کە هەموو چەشنە دەمارگرژی و هەیەجانێك دەورووژێنێ، ملمی

---

27-Oxbridge
28-Fern ham
29-Mary Benton
30-Mary Seton
31-Mary Carmichael

تا عەرزی دانەواندبوو. لەلای راست و چەپمەوە چڵی گوڵی ئاڵتوونی و ئەرخەوانی بریقەیان دەهات و تەنانەت لەوەش دەچوو لە گەرمان یا بە ئاور سووتابن. لە لایەکی ترەوە شۆڕەبیە هەمووکات تازیەدارەکان دەگریان و پرچیان بەسەر شانیاندا بڵاو ببووەوە. چۆمیش بە ئیشتیای خۆی وێنەی ئاسمان و پردی و درەختە گڕگرتوەکانی پێشان دەدەدا، کاتێ خۆێندکارێك بە گەمیەکەیەوە بە سەوڵ لێدان لە نێوان ئەم وێنانەوە تیدەپەڕی دیسان یەکیان دەگرتەوە، وەك بڵێی ئەو هەر قەت نەشبووە. لەوێ دەکرا چەند کاتژمێر لە خۆتدا نوقم بی. هزر-ئەگەر شایانی ئەم ناوە بە شان و شکۆیە بێ - پەت و قولاپەکەی خۆی هاویشتبووە ناو چۆمەکە. قولاپەکە دەهات و دەچوو، سات بە سات، لێرەو لەوێ لە نێو وێنەکان و گیایەکاندا، لێ دەگەڕا ئاوەکە بیهێنێتەوە سەرێ و بیباتەوە بنەوە، تا-ئەو ڕاکێشانە بچوکەی وا دەزانن- ئەو هەڵقولانە لە کتوپڕەی هزر بە قولاپەکەوە بووە پاشان بە ئەسپایی هەڵکێشانەکەی و بە هێوری لە سەر عەرزی دانانەکەی؟ مەخابن ئەو بیرۆکەیەی من وا ئێستاکە لەسەر چیمەنەکە دانرابوو، چەندەبێ نرخ وەبەر چاو دەهات، چەندە بێ بایەخ لەو ماسیانە دەچوو وا ماسیگری بەئەزموون دەیخاتەوە نێو ئاو بەهیوای ئەوەی قەڵەوتر بێت و ڕۆژێ لە ڕۆژان بەکاری برژاندن و خواردن بێ. بە گێڕانەوەی ئەو فیکرەوە سەرتان ناهێشێنم، هەرچەندە ئەگەر سەرنج بدەن، لەوانەیە خۆتان لە ناو قسەکانی ئەمڕۆکەمدا ببیننەوە.

بەڵام ئەو بیرۆکەیە، هەرچەندیش سووك بێ، تایبەتمەندیەکی ڕەمزاوی لە جۆری خۆی هەبوو- هەرکە دەکەوتەوە ناو زەین، گرینگ و هەست ورووژێن دەبوو لە هەمان کاتدا کە وەدەر دەکەوتەوە و دەسووڕاوە و سەری بەم لاوبەولادا دەکرد، هەرا و هەڵلالایەکی فیکری وای ساز دەکرد کە ئۆقرەی لێ دەگرتی. کە وەخۆ هاتمەوە دیتم ئەوە خەریکم بە خێراییەکی زۆر بەسەر چیمەنەکەدا تێدەپەڕم. دەستبەجێ قەڵافەتی کابرایەکم لێ پەیدا بوو تاوەکو ڕامگرێ. سەرەتا نەمزانی ئەو قەڵافەتە سەیرە بەو جل و بەرگە یەکسەرە فەرمییەیەوە ئاماژە بە من دەکات. لە دەم و چاوی ترس و تووڕەیی دەباری. غەریزەم لە جیات بەڵگەهێنانەوە، وەفریام کەوت. ئەو مەعموور بوو منیش ژن. ئەمە چیمەن بوو ئەوی دیکەش ڕێگە. هەر ئەندامان و لێکۆڵەران ڕێی کەڵك وەرگرتن لەم شۆێنەیان پێدراوە من دەبێ بەو ڕێگە خیزەڵانەدا بڕۆم. ئەم بیرۆکانە خێرا بە مێشکمدا تێپەڕین. کاتێ گەڕامەوە ڕێگە خیزەڵانەکە، دەستەکانی کابرا نیشتنەوە و دەموچاوی ئارام بووەوە، هەرچەندە ڕۆیشتن بە سەر چیمەنەکەدا خۆشترە لە ڕۆیشتن بەسەر خیزەڵانەکەدا، زەرەرێکی زۆری لێ نەدرابوو. تاقە تۆمەتێك کە دەمتوانی بیخەمە پاڵ ئەندامان و لێکۆڵەرانی هەر کۆلێژێکی دەچووم، ئەوە بوو

وا له بەر ئاگاداریکردنی چیمەنێك کە سێسەد ساڵی ڕەبەقە لە سەر عەرزیە ماسیە بچوکەکەی منیان ڕەپێ ناوە.

ئیتر وەبیرم نەدەهاتەوە چ بیرۆکەیەك ئاوا ئازایانە پاڵی بەمنەوە نابوو بێ ئیزن وە ژوور کەوم. ڕۆحی سوڵح وئارامشت وەك هەورێك لە ئاسمان دارژا خوارێ، چونکە ئەگەر ڕۆحی سوڵح مەنزڵێکی هەبێت، ئەوە ئەبێتە حەوش و حەسارە چوار سووچەکانی ئاکسبریج لە بەرە بەیانێکی ئۆکتۆبەردا. لەکاتی پیاسە کردن بە نێوان ئەو پەیمانگەیانە و تێپەرین لە پەنا ئەو هۆڵە قەدیمی و کۆنانەدا لەوە دەچوو نارێکوپێکی زەمانی حاڵ ڕێکوپێك بووبێ وەك بڵێی قەفەسەیەکی شووشەی مۆعجیزە ئاسا وا هیچ دەنگێکی لێوە ناچێتە ژوور جەستەی مروڤی داگرتبێ، زەین، لە گشت جۆرە پێوەندیەك لەگەڵ راستەقینەکان دەربازببوو(مەگین جارێکی تر سەرپێچی کردبایە و گەڕابایەتەوە ناو چیمەنەکە) دەستی ئاواڵە بوو تاوەکو ڕابمێنێ لە هەرشتێك وا لەگەڵ ساتدا دەسازا. بە هەڵکەوت، بیرەوەریەکی کۆنی نامیلکەیەکی قەدیمی سەبارەت بە دیداری دووبارە لە ئاکسبریج لە تەحتیلاتێکی زۆردا وە بیر چارلز لەمب"٣٢"م دەخاتەوە. - وا تەکری"٣٣" نامەکەی خستبوە سەر نێو چاوانی و پێی کوتبو قددیسی چارلز. ئەوەی راستە لەنێو هەمو کۆچکردووەکاندا (فیکرەکانم هەربەو چەشنەی دەهاتنەوە یادم بۆو دەگێرمەوە)لەمب یەکێکە لە باشترینەکانیان، پێت خۆشبوو لێی بپرسی، چاکە پێم بڵێ بابزانم ئەو نامیلکانەت چۆن نووسیون؟ بیرم لەوە کردەوە کە نامیلکەکانی ئەو تەنانەت لە نامیلکەکانی مەکس بیربۆم "٣٤"یش کە زۆر تەواو وپوختن، باشترن لەبەر ئەو پڕیشکە لە ناکاوانەی خەیاڵ، ئەو بروسکەی مرخ و توانابییەی وا عەیبدار و ناتەواو، بەڵام پڕ لە ئەستێرەی شیعری دەکات. لەمب رەنگە سەد ساڵ لەوە پێش هاتبێتە ئاکسبریج بەدڵنیاییەوە نامیلکەیەکی نووسی —نێوەکەییم وەبیر نایاتەوە-سەبارەت بە دەسنووسی دانەیەك لە شیعرەکانی میلتۆن"٣٥" وا لێرا دیبوی. لەوانەیە شیعری لیسداس"٣٦" بووبێ لەمب نووسی بۆی زۆر جێگەی سەرسووڕمان بووە کە وشەیەك توانیویەتی لە لیسداسدا لەگەڵ ئەو شتەی وا هەیە جیاوازی هەبێت. هێنانە بەرچاوی ئەوەی کە میلتۆن وشەکانی ئەو شیعرە دەگۆڕێ بە تاوان هەژماردبوو. ئەم شتە بووە هۆی ئەوەی هێندی بۆم بکرێ هۆنراوەی لیسداس وەبیر خۆم بێنمەوەو خۆم بەو مەزندە و

---

32-Charles Lamb
33-William Thackeray
34-Max Beerbohm
35-John Milton
36-Lycidas

گومانانەوە سەرقاڵ کەم کە میلتۆن چ وشەیەکی گۆڕیوەو بۆچی. پاشان بە زەینمدا هات کە ئەو دەسنووسەی لەمب دیبووی بەقەرا چەند میتر لە من دووره، و کەواتە دەکرا بە دووی لەمبدا لەو حەوشە چوار سووچەوە تێپەڕی و بچیە ئەو پەرتوکخانە بەناوبانگەی وا ئەم گەنجینەیەی ناوبراوی تێدا دەپارێزرێ. جگە لەوە بەدەم جێبەجێکردنی پیلانەکەمەوە وەبیرم هاتەوە کە دەسنووسی ئیزمۆندی"[٣٧]" تەکریش هەر لەوێ ڕاگیراوە. رەخنەگران زۆر جار دەڵێن کە ئیزمۆند باشترین رۆمانی تەکری بووە. بەڵام، هێندی وەبیرم بێت، دەسکردی بوونی شێواز و کۆتوبەندەکانی سەدەی هەژدەیەم تێکدەری خوێندنەوەکەی دەبوو مەگین کە شێوازی سەدەی هەژدەیەم شتێکی ئاسایی بووبێ لای تەکری- ئەمە راستەقینەیەکە کە دەکرێ بە چاو لێکردنی دەسنوسەکە و پێداچوونەوەی ئەوەی کە ئەم گۆرانکاریانە بە قازانجی شێوازەکە بووە یان مەعناکەی بیسەلمێنی. بەڵام ئەو کات دەبێ بڕیار بدەین لەسەر ئەوەی کە وا شێواز چیە و واتا کامەیە، ئەو پرسیارەی کە- بەڵام ئیتر ئێستەکە لەبەر دەرکەی چونە ژوورەوەی پەرتوکخانەکە بووم. بە دڵنیاییەوە کردبوومەوە، چون دەستاوبەجێ ئاغایەکی دلۆڤان وریش سپی و قەڵس وەك فریشتەیەکی نیگەهبان کەلەجیات باڵە سپیەکانی بە راوەشاندنی جلە ڕەشەکانی ڕێگە دەگرێ لەبەردەممدا شین بوو بەدەم ئەوەی کە بەرەو دواوە پاڵی پێوە دەنام بە سووکی عوزرمایی خواست و گوتی کە وا خانمەکان دەبێ لەگەڵ یەکێ لە ئەندامانی زانکۆ بن یان پسوولەیان پێ بێت جا ئیزنی هاتنە ژوورەوەیان هەیە.

جنێودانی ژنێك بە کتێبخانەیەکی بە ناو بانگ هەر لەگەڵ گۆێ پێ نەبزووتنی ئەو کتێبخانە بەناوبانگە بەرامبەر دەبێتەوە. بەو پەڕی لەسەرەخۆیی و خۆڕاگریەوە، لەکاتێکدا گشت گەنجینەکانی لە ناو دڵیدا ڕاگرتووە و لەوێدا بەستوونییەتەوە، بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە دەنوێ و، ئەوندەی پێوندی بە منەوە هەیە، هەتاهەتایە لە خەودا دەبێت. بەدەم ئەوەی کە بەتوڕەییەوە لە پلیکانەکان دەهاتمە خوارێ سوێندم خوارد ئیتر قەت ئەو خەوە تێك نەدەم. ئیتر قەت چاوەڕوانی میوانداریيان لێ نەکەم. هێشتا کاتژمێرێکی مابوو بۆشێوی نیوەڕۆ دەبوایە چیم بکردبایە؟ لەسەوزەڵانەکەدا پیاسەم بکردایە؟ لەپەنا چۆمی دابنیشتبایەم؟ بێ گومان بەیانییەکی پاییزی جوان بوو گەڵای دارەکان لەم لاو لەولاوە بارانێکی سووریان بەسەر عەرزیدا دەباراند هیچکام لەو دوو کارە هێند گران نەبوون. بەڵام دەنگی موسیقام هاتەگۆی. جەژنێك یان ئاهەنگێك بەڕێوە دەچوو. کە لە پەنا دەرکی کلیساکەوە تێپەڕیم، ئۆرگەکە دەنگێکی بەشکۆی لێوە هات. لەو کەشە

37-Esmond

هێمنەدا، تەنانەت پەژارەی مەسیحیەتیش پتر لە بیرەوەرییەك لە پەژارە دەچوو تاوەك لە خۆی بچێ. تەنانەت دەتگوت گازندەکانی ئۆرگی کەوناراش پەردەی سوڵحیان تێوە پێچراوە. ئەگەر مافی چوونە ژوورەوەشم هەبوایە، پیم خۆش نەبوو بچمە ژووری ئەم جارەیان لەوانە بوو خزمەتکاری کلیسا بەرم پێ بگرێ و بۆ وێنە داوای بەڵگەی غوسڵی تەعمیدم (پاك و خاوێنی ئایینی) لیّ بکات، یان پسوولەیەکی بەرپرسی زانکۆ. بەڵام دەرەوەی ئەم شۆێنە بە شکۆیانە زۆر جاران بەقەرا ژوورەوەیان خۆشە. جگە لەمە چاولێکردنی جەماوەر لە کاتی چونە ژوور و هاتنەدەر، جموجۆڵیان لەبەر دەرکی کلیسا، وەك کۆبوونەوەی مێشەنگوین لە بەردەمی کەندودا زۆر سەرنجراکێش بوو. زۆریان کلاویان لە سەردا و عەبایان لەبەردا بوو. هەندێکیان شاڵی پێستەیان بەسەر شاندا دابوو هەندێکی تر لە سەر کورسی تەگەردار دانیشتبوون ئەوانیتر هەرچەندە هێشتا پیر نەببوون، چرچ ببوون و شکابوونەوە و قیافەیەکی هێندە سەیریان بوو مرۆڤیان وەبیر ئەو قرژاڵە زەبەلاحانە دەخستەوە وا زۆر بەزەحمەت بە سەر زیخی ئاکواریۆمدا دەرۆن. هەروا کە بە دیوارەکەوە پاڵم دابووەوە، بە زەینمدا هات کە لە راستیدا زانکۆ شۆینێکە بۆ پاراستنی چەشنە دەگمەنەکان، ئەو چەشنانەی ئەگەر ناچار بن بۆ مانەوەی خۆیان لە پیادە ڕەوی شەقامی ئێسترەند"[٣٨]" بجەنگن، زۆر زوو تێدا دەچن. وەبیر چیرۆکە لەمێژینەکان سەبارەت بە سەرۆکە کۆنەکانی زانکۆ کەوتمەوە. بەڵام هێشتا ورەی فیتو لێدانم نەهاتبوە بەر — دەیانگێراوە پرۆفیسۆر... ی پیر بە فیقەی فیتوەکە دەستبەجێ غاری دەدەدا-کە ئیتر خەڵکە بە ریزەکە چوبوونە ناو کلیساکەوە. دەرەوەی کلیسا راوەستاو بوو لە جێی خۆی. هەروەکی دەزانن، گومبەزی و بورجە بەرزەکانی، لە کەشتیەکی گەرۆك دەچن وا هەموو کات لە سەفەردایە و قەت ناگاتە جیّ، شەوانە رووناك دەکرێن و تا چەند کیلۆمەتر ئەولاتر و لە دوور دوورەوە لەو بەری گردەکانیشەوە، هەر دەبینرێن. لەوانەیە ڕۆژگارانێك ئەم حەسارە چوار سووچە بەو چیمەنە ریّك وپێکانەشیەوە، بەوبیناە گەورە و کلیسایەشیەوە، زەلکاو بووبیّ شۆینێك وا گژوگیایەکانی شەپۆلیان داوە و بەراز لێی لەوەڕاون. بیرم لەوە کردەوە کەوا حەتمەن ئەسپ وکەڵ، جوت جوت و دەستە دەستە، بە ئەرابە بەردیان لە ولاتانی دورەوە هێناوەو، پاشان ئەم بلۆکە خۆڵەمێشیانە وا هەنووکە لە بەر سێبەرەکەیان راوەستاوم، بە کار و هەوڵێکی بێوچان بە ریز لەسەر یەك داندراون، پاشان شێوەکاران شوشەی پڕ لە نەقش و نیگاری پەنجەرەکانیان هێنابوو، و بەنناکانیش چەند سەدە لەسەر ئەو بانە بە چیمەنتۆ و پێمەڕە و ماڵە خەریك بوون. حەتمەن هەر

38-strand

شەممۆیەك و کەسێك زێر و زێوی لە ناو جانتایەکی چەرمەوە هاویشتوەتە ناو پەلە قەڵەشاوەکانیان، لە بەروەی ڕەنگە شەوی شەممۆیان، کاتی کایە و ئاوجۆخواردنەوەیان بووبێ. بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە رووبارێکی بێکۆتایی لە زێڕ و زیو بەردەوام لەم حەوشەدا هاتبێ و چووبێ تاوەکو بەردەکان یەکڕیز بێن و بەنناکان بەردەوام کار بکەن، رێك وپێکی کەن، ئاوەڕۆهەڵکەنن و قووڵی کەن و ئاو هەڵگۆیزن. بەڵام ئەو کات سەردەمی ئیمان بوو وە پارەیەکی زۆر بەرەو ئێرا دەهات تاوەکو ئەم بەردانە لەسەر بناغەیەکی قایم دابنێن، ئەو کاتەی دیوارەکان هەڵ دەچنران، دیسانەوە پولێکی پتر لە لایەن خەزێنەی شایەکان و شاژنەکان و نەجیبزادەکان بەرەو ئێرا دەهات تا دڵنیابن لەوەی کە لێرا سروودی ئایینی دەچڕن و مامۆستایان وانە دەڵێنەوە. زەوی و زارێکی زۆریان پێ دەبەخشرا و ماڵیاتیان دەدرایە. و ئەو کاتەی سەردەمی ئیمان کۆتایی پێهات و سەردەمی ئاوز سەری هەڵدا، هێشتا هەر هەمان زێڕ و زێوەکە لەگۆڕێدا مابوون کورسیگەلی لێکۆڵینەوە داندران، کورسی ئوستادی دامەزرا ئەمجارەیان ئیتر زێڕ و زێو نەك لە خەزێنەی شاهانەوە بەڵکو لەناو سندوقی بازرگانان و بەرهەمهێنەرانەوە بەراو ئێرا دەهات، لە تورەکەی ئەو پیاوانەی وادەکرێ بڵێین پارەیەکی زۆریان بە پیشەسازی کۆ کردبوەوەو لە ناو وەسیەت نامەکانیاندا بەشێکی زۆریان دەداوە بەو زانکۆیەی پیشەکەی خویانی لێ فێر ببوون بۆوەی کۆرسێکی زیاتر بۆ لێکولێنەوە و وانەگوتنەوە دابمەزرێنن. ئا لێرەوە پەرتوکخانەکان و تاقیگاکان و رەسەدخانەکان دامەزران کەلوپەلێکی بێ وێنە و کەرەسەیەکی گران بەها وناسك وا ئێستەکە لەناوقەفەسەی شوشەدان، لەوشوێنەی چەند سەدە لەوەپێش گژوگیا شەپۆلیان دەداو بەراز دەلەوەڕان. بەدەم پیاسەکردنەوە، بە زەینمدا هات کەوابناغەی زێڕ و زێو خاترجەم بەڕادەیەکی پێویست قایم بووە سەنگفەرشە پتەوەکەی پیادەرەوەکە گیاکێویەکانی داپۆشیبوو. پیاوانی کەشەف لەسەر سەر بەپەلە لە پلیکانێکەوە بۆپلیکانێکی تر دەچوون. خونچە ڕەنگاو ڕەنگەکان لە ناو گوڵدانی بەر پەنجەرەکان پشکوتبوون. دەنگی خڕەخڕی زۆری گرامافۆنەکە لە دیوەکانەوە دەهات. مەحاڵ بوو مرۆڤ نەکەوێتە فیکرەوە-ئەو فیکرە هەرچیەك بوو، لەپڕ تێکدرا. دەنگی کاتژمێرەکە هات. کاتی ئەوە بوو رێگەی خواردنگە ببینمەوە.

سەیرە رۆماننووسەکان بە شێوازی خۆیان بەوەمان قایل دەکەن ئەو شتەی وا هەموو کات خواردنی شێوی نیوەڕۆمان لە یاددا دەهێڵێتەوە یان قسەیەکی خۆشی کەسێك یان کاری سەرنج ڕاکێشی کەسێکە. کەچی بە دەگمەن وشەیەك باسی ئەو شتە دەکەن کە خوردراوە. ئەمە بەشێك لە نەریت و ڕێوشۆینی کاری ڕۆماننووسە وا ئاماژەیەك بە شۆربا و ماسی قزل ئالا و مراوی نەکا، هەر دەڵێی شۆربا و ماسی قزل ئالا و مراوی گرینگیەکیان نییە، هەر دەڵێی قەت کەس جگەرەی نەکێشاوە یان شەرابی نەخواردوەتەوە. بەڵام من لێرەدا ڕێی ئەوە بە خۆم دەدەم ئەم نەریتە تێك دەم

و پێتان بڵێم وا لەم بارودۆخە تایبەتەدا خواردنەکە بە ماسیەکی سۆل لە دەوریەکی قووڵدا دەستی پێکرد کە چێشتلێنەری کۆلێژ تەواوی بە سۆسی سپی سواغ دابوو جگە لە چەند پەڵەی قاوەیی وەك پەڵەی لاشانی مەرە کێویەکی مێو کە سۆسە سپیەکەیان لەم لا و لەو لاوە قاوەیی دەکرد. پاشان نۆرەی کەو هات، بەڵام ئەگەر ئەم قسەیە چەند باڵندەیەکی ئاوەپرِوزی قاوەییتان لەسەر بلۆتێك دەخاتەوە یاد، زۆرخراپ بە هەڵەدا چون. کەوێکی زۆر وجۆراوجۆر لەگەڵ کۆڵێ شتی دیش، سۆس وسالاد، بەتامی تیژوشیرین، بە ڕیز لەسەر مێز داندران پەتاتەکەی ناسك وەك لیرە بەڵام نەك هێندە ئەستور کەلەمە سوورەکەی وەك گوڵەباخ بادرابوو بەڵام پتەوتر. هێشتا کەوی برژاو تەواو نەببوو کە پیاوێکی خزمەتکاری بێدەنگ، لەوانەیە هەمان مەئمووری چیمەنەکان بێت بە ڕواڵەتێکی هێمن ترەوە، دیسێرێکی لە ناو دەسرەی سفرەکەدا لەبەر دەمی ئێمە دانا کە ئەگەر ناوی پودینگی لەسەر دانێین و لەئاکامدا بیبەستینەوە بە برینج و نیشاستەوە ئەوە سووکایەتی پێ دەکرێ. لەم نێوانەدا پیاڵەی شەرابی زەرد و سوور بەتاڵ دەکران و پڕ دەبوونەوە. بەم جۆرەتا نێوەڕاستی برِبرِەی پشت کە ڕۆحی تێدایە روون دەبوەوە مەبەست ئەو تیشکە کارەباییە تۆسنە نییە وا پێی دەڵێین روناکایی و لە زارمانەوە بەرەو ناخمان یان دەرەوە دەچێ، بەڵکە ئەو بریسکەیەکی قووڵترە، کەمترهەستی پێدەکرێت و شاراوەترە، بڵێسەی زەرد و گیان لەبەری دواندنی ئاوزەمەندانەیە. پەلەیەکی ناوێ. هەرا و هوریایەکی ناوێ. نایهەوێت کەسێکی تر بیت. ئێمە هەمووومان دەچینە بەهەشت و وەندایکیشمان لەگەڵە."[39] بە واتایەکی تر، ژیان زۆر خۆش وەبەرچاو دەهات، خەڵاتەکانی زۆر جوان و شیرین بوون، ئەم دڵتەنگی و ئەو تاسەیە زۆر بچوك و هیچەکە بوو، هاوڕێیەتی و قسەکردن لەگەڵ کەسێکی وەك خۆت زۆر پرِپایەخ بوو، هەر وەك داگیرسانی جگەرەیەکی باش و خۆدادان بەسەر کۆسەنەکانی پەنا پەنجەرەکە.

[39]- ئانتونی وەندایك (Anthony Vandyke؛١٦٤١-١٥٩٩) کە دواتر لە بارەگای چارلزی یەکەم نازناوی سیری وەرگرت، شێوەکارێکی ئیسپانیایی پسپۆرلە پورترێ دا بوو. توماس گێینزبرو(٨٨-١٧٢٧) نیگارکێشی ئینگلیسی، لە کاتی مەرگدا بە گوێی سێرجاشوارێینولدز (١٧٩٢-١٧٣٣) نیگارکێشی تری ئینگلیسی هاوسەدەی خۆیدا چرپاند: «هەمومان دەچینە بەهەشت وە هەندایکیشمان لەگەڵە. دەکرێ ئاوا قسەکەی گێینزبرو لێك بدەیەوەکە «ئێمە هەمو نیگارکێشان دەچینە بەهەشت و وەندایکیش لەناو گروپی ئێمەدایە» هەرچۆنێك بێ ئەو قسەیەی ئەو بریتیە لە ئاسودەیی و قاییل بونی لەدواین ساتەکانی ژیانیدا. و. ف

ئەگەر لە نوور و نێوچاوانەکەم تەپڵەکەکەم لەبەر دەستا بوایە، ئەگەر لەبەر بێ تەپڵەکی سووتووی سیغارەکەم لە پەنجەرەکەوە نەکردایەتە دەر، ئەگەر بارودۆخەکە بڕێك لەگەڵ ئەوەی کە بوو جیاوازی بوایە ڕەنگە ئەو پشیلە کلك بڕاوەم نەدەدی. دیتنی ئەو ئاژەڵە سەیر و بەپەند بووە کە بێدەنگ لەو حەسارە چوار سوچەدا دەگەڕا بە هەڵکەوت بووە هۆی تێگەیشتنێکی هەست و نەستی منی گۆڕی. وەك ئەوەی کەسێك پەردەیەکی لا دابێ. لەوە دەچوو کاریگەریی ئەو شەرابە باشە وردە وردە بەرەو تەواوی بڕوا. بەدەم چاولێکردنی ئەو پشیلە کلك قرتاوەوە وا لە نێو چیمەنەکەدا ڕاوەستابوو- لەوە دەچوو ئەویش لەم جیهانە بەشك بێ- پێم وابوو شتێك کەمە، جیاوازە. هەر وا کە گۆیم بۆ قسەکان ڕادە گرت، لە خۆمم پرسی چ شتێك کەمە، و چی جیاوازە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبوو خۆم لە دەرەوەی ئەم ژوورە وەبەر چاو بهێنابایە، لە ڕابردوویەکی کۆندا، لە واقیعی بەر لە جەنگدا دیمەنی میوانداریییەکی نیوەڕۆی ترم وەبەر چاوم هێنابایەتەوە وا لە شۆێنێکی نزیکی ئێرا بەڵام جیاواز بەڕێوە چوبوو. هەموو شتێك جیاواز بوو. لەم نێوانەدا، ئاخاوتنی میوانەکان کە زۆر بوون و گەنج، هەندێکیان لەم ڕەگەز و هەندێکیان لە ڕەگەزێکی تر، درێژەی پێدرا، بە ئاسانی بە سەرخۆشی، بەئازادی بە دەم گاڵتە و پێکەنینەوە. هەروا کە ئەم ئاخاوتنە لە گۆڕێدا بوو، من لەگەڵ ئاخاوتنەکەی تر بەراوردم کرد، بەم بەراوردکردنە دڵنیا بووم لەوە کە یەکیان لە ڕەگەزی ئەوی تر و میراتگری بەرحەقی ئەوی تر بوو. شتێك نەگۆردرابوو شتێك نەگۆردرابوو مەگین- لێرەدا بەدڵ و بە گیان نەك بۆ ئەو شتەی دەگوترا، بەڵکو بۆ دەنگی ئەو بزاڤەی وا لە پاشیەوە بوو گۆیم ڕادەگرت. بەڵێ، هەر ئەوە بوو-گۆرانکاریەکە لێرەدا بوو. بەر لە جەنگ، لە میوانداریییەکی ئاوەهادا، خەڵکی هەر ڕاست ئەم قسانەیان دەکرد، بەڵام قسەکانیان هەوایەکی تری هەبوو چونکە لەو ڕۆژانەدا سۆز و نارەنارێکی لەگەڵ بوو، ویرەویرێك وا لێی حاڵی نەبی، بەڵام ئاوازدار و هەژێنەر، وا بایەخی خودی وشەکانی دەگۆڕی. ئایا کەس پێی دەکرا بەرگی کەلام بەبەر ئەو نارە نارەدا هەڵبکێشی؟ لەوانەیە بە هاریکاری شاعیران بکرابایە. کتێبێکم لە پەناوە بوو، هەڵم داوەو زۆر بە هەڵکەوت چاوم بە شێعرێکی تنیسۆن کەوت. دیتم ئەوا تنیسۆن بە هەرا و گۆرانی دەیڵێت:

لە گوڵە ساعەتیکەی بەر دەروازەکەوە
دڵۆپە فرمێسکێکی بەشکۆ کەوتە خوار.
ئەو دێت، کۆترەکەی من، خۆشەویستەکەی من
ئەو دێت، ژیانی من، چارەنووسی من

گوڵەباخ هاوار دەکات: «نزیك بووەتەوە، نزیك بووەتەوە»
گوڵی ڕۆزی سپی دەناڵێنێ: «وەدرەنگ کەوتووە»
زمان بە دزییەوە گوێ رادەگرێ: «دەی بیستم، دەی بیستم»
وەسۆسنە دەسرتێنێ: «چاوەن ڕووان دەبم.»"[٤٠]"

ئایا ئەمە هەر ئەو شتە بوو وا پیاوان لە میوانداریيەکانی نیوەڕۆی بەر لە شەڕ ویرەیان دەکرد؟ ژنانیش؟

دڵی من چەشنی باڵندەیەکی گۆرانیبێژە
وا لە نێو نەمامێکی تازە ئاودراودا هێلانەی کردووە
دڵی من چەشنی دارەسێوێکە
وا بەری زۆر چڵەکانی شۆڕ کردووەتەوە
دڵی من چەشنی سەدەفێکی رەنگاو رەنگە
لە ناو زەریایەکی هێمندا
دڵی من لە گشت ئەمانە خۆشترە
لەبەر وەی ئەوینەکەم هاتووەتە لام."[٤١]"

ئایا ئەوە هەر ئەو شتە بوو وا ژنان لە میوانییەکانی نیوەڕۆی بەر لە شەڕدا لەبەر خۆیانەوە دەیان گوتەوە؟

هێندەم هێنانە بەرچاوی ئەوەی کە خەڵك لەمیوانداریيەکانی بەر لە شەڕ، ئەگەر لەبەر خۆشیانەوە بێ ئەم شتانەیان ویرەویر کردووە پێ قۆڕ بوو، پێکەنین گرتمی ناچار بووم پاساوی پێکەنینەکەی خۆم بە ئاماژە کردن بەو پشیلە کلك قرتاوە بدەمەوە ئەو بەستەزمانە، بێ کلك، لە

---

٤٠- بەشێك لە شێعری «دایە، وەرە بۆ باخچە» (come into the Garden,Maud) هۆنراوەی ئالفرێدلۆرد تنیسۆن(١٨٩٢-١٨٠٩)، شاعیری ناوداری ئینگلیسی سەردەمی ویکتۆریا و گەورە شاعیری دەرباری ئینگلیستان. -وف

٤١- بەشێك لەشیعری بەناوبانگی «جێژنی لەدایك بوونێك»('A Birthday') هۆنراوەی کریستینیا رۆزێتی (١٨٩١٨٩٤-١٨٣٠١٨٣٠) ژنە شاعیری بە ناو بانگی سەردەمی ویکتۆریا. رۆزێتی قەت بە قەرا تنیسۆن ناوبانگی نەبوو ڤۆڵف بە دانانی تنیسۆن و رۆزێتی لە پەنا یەکتر، جەخت لەسەر بایەخی رۆزێتی لە ناو کۆمەڵگای ئەدەبی بریتانیا دەکات و ئەو بە هاوتای تنیسۆن دادەنێت. -وف

نێو ئەو سەوزەڵانەدا هەر بە راست کەمێك سەیر وەبەر چاو دەهات. بڵێی ئەوە هەر ئاوا لە دایك بووبێ یان کلکی لە کارەساتێکدا لە کیس چووبێ ؟ هەر چەندە هەموان دەڵێن پشیلەی بێ کلك لە ئایل ئاف مەن"[٤٢]" هەیە، لەو شتەی کە ئێمە پێمان وایە نایابترە. ئاژەڵێکی سەیر و سەمەرەیە. پتر کەم وەدەست ئەکەوێ تا جوان بێ. سەیرە کلك چ جیاوازیەك ساز دەکات- لەو قسانەی خەڵك لە کۆتایی میواندارییەکانی نیوەڕۆان دەیکەن، بەدەم گەڕان بەدووی کۆت و کڵاوەکانیاندا.

ئەمەیان لە بەر بەدەوردا هاتنی زۆری خانەخۆی، تا ئێوارەی پێ چوو. وردە وردە ڕۆژێکی جوانی ئۆکتۆبەر ون دەبوو ئەو کاتەی بە شەقام دا تێدەپەڕیم گەڵای دارەکان دەوەرین. بەدەم تێپەڕین لە نێویانەوە، لەوە دەچوو دەروازەکان یەك بە دووی یەکتردا قایم و هێور

بە دوومدا دادەخرێن. مەئمورانێکی بێ ئەژمار کلیلێکی بێ ئەژماریان دەخستە ناو قوفڵگەلێکی رۆن لێدراوەوە خەزێنە بۆ شەوێکی تر ئەمن دەبووەوە. شەقامەکە بە جادەیەك کۆتایی پێدێ-ناوەکەیم لە بیر چوەتەوە-ئەگەر راست بایدەیەوە دەتگەیەنێتە فرێنهام. بەڵام دەرفەت زۆر مابوو. تا کاتژمێر حەوت و نیو چاوت بە شێوی شەو نەدەکەوت. پاش نیوەڕۆخوانێکی ئاوەها، هەر دەکرا باسی شێوخواردن نەکەی. سەیرە چلۆن برِگە شێعرێك ئاوا زەین دادەگرێت و وا لە لاق دەکات بە ڕیتمەکەی لەو جادەیەوە تێپەڕێ. بەدەم ئەوەوە کە خێرا بەرەو هێدینگلی"[٤٣]" دەچووم، ئەو وشانە لەناو دەمارەکانمدا دەگەڕان:

لە گوڵە ساعەتیکەی بەر دەروازەکەوە
دڵۆپە فرمێسکێکی بەشکۆ کەوتە خوار.
ئەو دێت، کۆترەکەی من، خۆشەویستەکەی من
پاشان، لەو شۆینەی وا ئاو لە کاتی گەیشتن بە رووبار دەهاژێنی، ریتمەکەیم گۆڕی و چرِیم:
دڵی من چەشنی باڵندەیەکی گۆرانی بێژە
وا لە سەر نەمامێکی تازە ئاودراودا هێلانەی کردووە
دڵی من چەشنی دارە سێوێکە...

ئای لەو شاعیرانە! بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد، بەو جۆرەی وامرۆڤ لەکاتی رۆژ ئاوا بووندا هاوار دەکات. عەجەب شاعیرانێك بوون!

---

42-Isle of Man
43-Headingley

پێموایە لە ئێرەیی بردنێك بەو رۆژگارانە بوو، هەر چەندە ئەو جۆرە هەڵسەنگاندنانە گەمژانە و قۆڕن، لە خۆمم پرسی ئەرێ بەراست دەکرێ دوو شاعێری زیندوو هەڵبدەی کە هاوپلەی تنیسۆن و رۆزێتی ئەو سەردەمە بن.

بە دەم ئەوەی کە چاوم بڕیبوە ئاوێکی بلقاویەوە، بیرم لەوە دەکردەوە هەڵسەنگاندنی ئەوانە کارێکی مەحاڵە. لە راستیدا هۆی ئەوەی کە شێعر ئاوەها دەرباز بوون و شەوق و زەوقێك لە مرۆڤدا ساز دەکات دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە سەر هەستێکدا هەڵدەڵێ وا رۆژانێك هەمانبووە. (لەوانەیە لە میوانداریییەکانی نیوەڕۆی بەر لە شەڕ)، کەواتە بە سانایی، ئاگاداری، وەڵامی دەدەینەوە، بێوەی خۆمانی پێوە هیلاك کەین و ئەو هەستەش هەڵسەنگێنین، یا لەگەڵ هەستی ئێستامان بەراوردی کەین. بەڵام شاعیرانی زیندوو هەستێك بەیان دەکەن کە لە راستیدا هەنووکە بەدیهاتووە و لە ناخی ئێمە لێدەبێتەوە. لە پلەی یەکەمدا، نایناسین، زۆر جار لەبەر هۆیەك لێی دەترسین زۆر باش پیایدا دەچینەوە و بە ئێرەیی بردن و نییەتێکی خراپەوە لەگەڵ ئەو هەستەی پێشوتر وا دەماننناسی بەراوردی دەکەین. کێشەی شێعری مۆدێرن ئەمەیە، و لەبەر ئەم کێشەیەشە ناتوانی پتر لە دوو دێڕە شێعر ی شاعێرێکی مۆدێرنی باش لەبەر بکەی. بەم هۆیەش —کەباشم لەبیر نەمابوو—ئەم باسە بە هۆی نەبوونی بەڵگەی شێعری بڕایەوە. بەڵام هەر بە دەم رۆیشتنم بەرەو هێدینگلی لە خۆمم دەپرسی بۆ چی ئیتر لە میوانداریییەکانی نیوەڕۆدا لەبەر خۆمانەوە نارەنارێك ناکەین؟ بۆ ئالفرێد چیتر ناچڕێ:

ئەو دێت، کۆترەکەی من، خۆشەویستەکەی من؟
بۆ کریستینیا چیتر لە وەڵامدا ناڵێ:
دڵی من لە گشت ئەمانە خۆشترە
لەبەر وەی ئەوینەکەم هاتووەتە لام؟

ئایا دەبێ شەڕ بە تاوانبار بزانین؟ لە ئوتی ١٩١٤دا کە تۆپەکان هاویشتران، ئایا پیاوان و ژنان هەر بە چاو لێککردن لەوە دەگەیشتن کە ئەوین و ئەویندارى چیتر نەماون؟ بێ شك دیتنی روخساری سەرکردەکانمان لەبەر تیشکی ئاگربارانداا (بە تایبەت بۆ ژنان بەو خەون و خەیاڵانەیان سەبارەت بە فێرکردن و راهێنان و شتی ترەوە) داچڵەکاندنێکی رۆحی زۆر گەورە بووە. ئەم سەرکردانە- ئاڵمانی، بەریتانیایی، فەرانسەوی- چەندە دزێو دەهاتنە بەرچاو، چەندە گەمژە. بەڵام هەرکەس و هەر شتێك بە تاوانبار دابنێین، ئەورۆکە ئەو خەیاڵەی وا بووەتە هاندەری تنیسۆن و کریستینا رۆزێتی بۆوەی بەو گوڕوتینەوە سەبارەت بە هاتنی دڵدارەکەیان شێعر بهۆننەوە، لە چاو

ئەو ڕۆژگارانە زۆر نایابترە. هەر ئەوەندەی بخۆینینەوە، چاو لێ کەین، گۆی بدەینێ و وەبیر خۆمانی بێنینەوە تەواوە. ئیتر بۆ بە دووی تاوانباردا بگەڕێین؟ ئەگەر ئەو خەیاڵە لەخۆڕایی بوو بۆ بە سەر ئەو کارەساتەدا هەر شتێك بووبێ، هەڵنەڵێین، ئەو کارەساتەی وا ئەو خەیاڵە لەخۆڕاییەی لەناو برد و حەقیقەتی لە جیات دانا؟ لەبەر وەی حەقیقەت... ئەم خاڵانە ئەوشۆینە نیشان دەدات وا، لەکاتی گەڕان بە دووی حەقیقەتدا، لە جیات وەی لە جادەکەوە بەرەو فرێنهام بایدەمەوە بەجێم هێشتبوو. بەڵێ هەڵبەت، لەخۆمم پرسی حەقیقەت کامەیە و خەیاڵ کامیانە. بۆوێنە حەقیقەتی ئەو خانووانە چی بوو وا ئێستاکە، لە کاتی ڕۆژئاوادا، بە پەنجەرە سوورەکانیانەوە لە خۆشیدا نوقم ونادیارن، بەڵام لە کاتژمێر نۆی بەیانیدا بە شیرینی و قەیتانی پۆتینەکانیانەوە، دزێو و سوور و قوڕبەسەرانە دەهاتنە بەر چاو؟ دارەبیەکان و ڕووبار و ئەو باخانەی لەبەر ڕووبارەکەدا بوون- هەنووکە سەرپۆشی ڕەمزاوی مژ دایدەپۆشین، بەڵام لە ژێر تیشکدا جیلوەی زێڕین و سووریان هەبوو-کامەیان حەقیقەت بوو و کامەیان خەیاڵ؟ بە پێچوپەنای بیرۆکەکانم سەرتان ناهێنمە ئێش، لەبەر وەی لەناو ڕێگەی هێدینگلی بە هیچ ئاکامێك نەگەیشتم و داواتان لێ دەکەم وای دابنێن زۆر زوو زانیم ڕێگەکەم خرا باداوەتەوە و دیسان ڕێگەی ڕاستم بەرەو فرێنهام گرتەبەر.

لەبەر ئەوەی پێشتر گوتومە ڕۆژێکی مانگی ئۆکتۆبەر بوو، غیرەتی ئەوەم نییە بە گۆڕینی وەرز و وەسفکردنی ئەو گوڵە یاسانەی بەسەر دیواری باخەکەدا شۆڕ ببوونەوە، و گوڵە زەعفەرانەکان و گوڵاڵە و گوڵەکانی تری بەهار خۆم لە بەر چاوی ئێوە بخەم و ناوی باشی چیرۆك خراپ کەم. چیرۆك دەبێ بە ڕاستەقینەکانەوە خەریك بێت، هەر چەندە ڕاستەقینەکان ڕاستتر بن، چیرۆکەکە باشتر خۆی بەدەستەوە دەدات —ئەمە ئەو شتەیە وا پێیان گوتوین-کەواتە هێشتا پاییز بوو و گەڵاکانیش هێشتا زەرد بوون دەکەوتنە سەر عەرزی، لەوانەیە هەر دەکرا بڵێی نەختێ خێراتر لە جاران دەکەوتنە سەرعەرزی چونکە ئیتر شەو داهاتبوو(کاتژمێر حەوت و بیست و سێ خولی ڕێك)و بایەك (ڕاست لە لای باشووری ڕۆژئاواوە) دەهات. بەڵام، لەپەنا گشت ئەمانەوە، شتێکی سەیر لەگۆڕێدا بوو:

دڵی من چەشنی باڵندەیەکی گۆرانی بێژە
وا لە سەر نەمامێکی تازە ئاودراودا هێلانەی کردووە
دڵی من چەشنی دارە سێوێکە
وا بەری زۆر لقەکانی شۆڕ کردوەتەوە

پێموا وشەکانی کریستینیا ڕۆزێتی تا ڕادەیەك دەوری هەبوو لە بزووتنەوەی ئەم خەیاڵەدا-باخەکە، پەپولەی بریمستون"[٤٤]"سوك و چالاك بەم لا ئەو لادا هەڵدەفڕین، و گەردەی گوڵ وەك تۆز کەوتبووە حەوا. بایەك هات، نازانم لە کاملاوە، بەڵام گەڵا تازە شینبووەکانی خستە حەوا، بەجۆرێکی وا کە لەناکاو رەنگێکی خۆڵەمێشی زێوین لە حەوادا بریقایەوە. تاریك و روون بوو، ئەو کاتەی وا رەنگەکان تۆخ دەبن بنەوش و ئاڵتوونی وەك ترپەی دڵێکی هەژاوەوە لەناو چوارچێوەی پەنجەرەدا لێدەدا کاتێك لەبەر هۆیەك جوانی جیهان ئاشکرا دەبێت، ئەو جیهانەی لە هەمان کاتدا بەو زووانە لەناو دەچێت(لەم کاتەدا پاڵم نا بە دەروازەی باخەکەوە و چوومە ژووری، لەبەر وەی دەرکەکە لەبەر کەمتەرخەمی ئاواڵە بوو و بەرپرسێکیش لەو دەوروبەرانە دیار نەبوو) جوانیی ئەو جیهانەی بەم زووانە لە ناو دەچێت، دووتوێیە، یەکیان پێکەنینە و یەکیشیان دڵەڕاوکێ، دڵیش دادەخورپێنن. باخەکانی فرێنهام لە هەوای تاریك و روونی بەهاردا، چڕ و فراوان، دەهاتنە بەر چاوم، لە نێوان گژوگیا درێژەکاندا، شیلان و گوڵە پیاڵەییە ئاڵۆز و شەونم لەسەرەکان، کە ڕەنگە لە باشترین کاتیشدا رێك و پێك نەبن، ئێستەکە بەدەم بایەکەوە دەهاتن و دەچوون و ریشەکانی خۆیان لە عەرزی دەهێنایە دەر. پەنجەرەکانی بیناکە، خڕبوون وەك پەنجەرەی پاپۆڕ لە نێوان شەپۆلی بێ ئەژماری خشتی سووردا، لەبەر هات و چۆی خێرای هەوری بەهاردا، لەبری لیمۆیی، زیوینیان دەنواند. کەسێك لە ناو جۆلانییەکی هەڵواسراو بەدارەکانەوە خەوتبوو، کەسێك- بەڵام لەبەر ئەو شەوقەدا پتر لە تاپۆیەك دەچوو، هەندێکی بە یاریدەی گومان و شیمانە، هەندێکیشی بە دیتن - لە نێو گیایەکاندا هەڵات-یانی کەس بەری پێناگرێت؟ -پاشان قەڵافەتێکی دانوواو لەبەر هەیوانەکە وەدیار کەوت، وەك بڵێی تازە خۆیا بووبێ تاوەك پشوویەك بداتەوە بەر خۆی و چاوێك بە باخەکەدا بگێڕێ، -بەهێز بەڵام خاکەڕا، نێوچاوانێکی بەرزی هەبوو بە جل و بەرگێکی شڕەوە. ئایا ئەوە هەر هەمان لێکۆڵەری بەناو بانگە، بۆخۆیەتی خاتوو جی ئێچ"[٤٥]"؟ هەموو شتێك نادیار بوو، کەچی

---

44-Brimstone

٤٥- J. H وۆڵف بە جین ئێلێن هەریسۆن (Jane Ellen Harrison) لێکۆڵەری بریتانیایی ئاماژە دەکات وا بە هۆی گوتەبێژیەکانی سەبارەت بە هونەری یۆنان، کتێبەکانی لەسەر ئایین و ئەفسانەکانی یونان، بیر و ڕا نائاسایی و ئاشکراکانیەوە بەناوبانگ بوو. هەریسۆن ئێستەکەش بەهۆی بەرهەمەکانی لەبواری هونەر و ئایینی یونانی کەون ئارا و بەشداریکردنی لە لێکۆڵینەوەکانی مرۆڤ شوناسی سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەناوبانگە، بەڵام ئەو کەمتر بە بۆنەی پێگەکەی لە مێژووی ژناندا دەناسن. هەریسۆن زۆربەی سەردەمی

تۆخ و کرژ، دەتگوت ئەو شاڵەی ئێوارە بە سەر باخەکەیدا دابوو بە تیخی هەسارە یان شمشێر دادڕابوو. بروسکەی حەقیقەتێکی ترسهێنەر، وەك هەمیشە، لەناودڵی بەهارەوە هاتبوە دەر. لەبەروەی لاویەتی...

سوپەکەم ساز بوو. مێزی شێویان لە هۆڵێکی گەورەی نان خواردندا رازاندبووەوە. هەوا هیچ لە بەهار نەدەچووو بەراست شەوێکی مانگی ئۆکتۆبەر بوو. هەموان لە هۆڵە گەورەکەی نان خواردن کۆ ببوونەوە. شێو ساز بوو. سوپەکەیان هێنابوو. بە ئاوی گۆشتی سادە سازیان کردبوو. شتێکی تێدا نەبوو تاوەکوو لەبەر ئەو بکەویتە بیر و خەیالان. دەتتوانی لە ژێر ئەو ئاوە روونەوە هەر وێنەیەك لە سەر دەوریەکە بیٚ ببینی. بەلاٚم وێنەیەك لە گۆڕێدا نەبوو. دەوریەکە سادە بوو. پاشان سەرەی گۆشت بوو لە پاڵیەوە سەوزی و پەتاتە-چیرۆکی لاکەوتەی گاڕانە مانگا و مەڕی ناو بازاڕی قوراوی دەهێناوە یاد، کەلەمە سوورەکەش سەرچڵەکانی زەرد و لوول بوو، لەسەر ڕۆیشتن و داشکاندنەکان، و ژنان بە جانتا کەنەفەکانیانەوە لە بەیانییەکی دووشەمدا. هیچ هۆیەك بۆ سکالاٚ کردن لە خواردنی رۆژانە نەبوو، لەبەر وەی چێشتەکە کەم نەبوو بیٚ گومان کرێکارانی کانزا بە لەوە کەمتریش قاییل بوون. هەڵووژە و کاستێری بە دودا هات ئەگەر کەسێك گلەییەك لەوە بکات کەوا هەڵووژە بە کاستێری خۆشکراویشەوە، هەر سەوزیەکی رەق و ناخۆشە (میوە هەر نییە)-ریشاڵ ریشاڵە وەك دڵی مرۆڤێکی قڕنیس بە ئاوێکی ترشەوە کە لەوانەیە لەناو دەمارەکانی مرۆڤێکی قرنیسدا بگەڕیٚ وا هەشتا ساڵە شەراب و گەرمای لیٚ درێخی کردوون کەچی بە هەژارانیشی نەداوە. -دەبیٚ بیر لە کەسانێك بکاتەوە وا تەنانەت هەڵووژەش لە بەزەیی خۆیان بێبەش ناکەن. پاشان سەرەی بیسکویت و پەنیر هات، لەم کاتەدا تونگەی ئاوەکە دەس بە دەس دەگەڕا، لەبەر وەی سروشتی بیسکویت ویشکیە، وئەمانەش تا سەر ئێسك بیسکویت بوون. هەر ئەوندە خواردن تەواو بوو. هەموان کورسیەکانی خۆیان بەرەو دواوە دەبرد دەرکە باوەشێنییەکان قایم بەرەو دواوە و پێشەوە پاڵ پێوە دەنران خێرایەکی هیچ ئاسەوارێکی خواردن بە هۆڵەکەوە نەما و بیٚ گومان بۆ نانی بەیانی رۆژی دواتر ساز دەکرا. لە رێرەوەکەدا لەسەر پلیکانەکان، گەنجانی بەریتانیا هەراهەرایان دەکرد و گۆرانیان دەگوت.

---

بزووتنەوەکانی خۆی لە کۆلێژی کەمبریج رابوارد، کەچی دەسەڵاتی ئەو سنوری ئەم کولێژەی بەزاند. ویرجینیا هاڤاڵی هەریسۆن بوو ئەوی بە مامۆستای خۆی دادەنا. -وف

ئایا دەکرا میوانێك، غەریبەیەك (لەبەر ئەوەی من هیچ مافێکم بەسەر فرێنهام ترینیتی"[46]"یان سامێرڤێل"[47]"یان گێرتەن"[48]"یان نیوهام"[49]"یاوەکو کرایست چێرچ"[50]"ەوە نییە) بڵێ «شێوی شەوێ خۆش نەبوو» یان بڵێ (من و مێری سیتۆن ئێستەکە لە ژووری دانیشتنەکەی ئەو بووین) «نەدەکرا لێرا لەم سەرە بەتەنێ نان بخۆین؟ چونکە ئەگەر شتێکی وام بگوتایە، خۆم لە راز و رەمزی ئابووری ماڵێك هەڵدەقورتان کە وەها رواڵەتێکی رازاوە بە شادومانی و ئازایەتی دەخستە بەر چاوی غەریبە. نا، نەدەکرا شتێکی وەها بڵێی. لە راستیدا ووت و وێژەکە بۆ ساتێك راوەستا. بە لەبەر چاو گرتنی جەستەی بەشەر، دڵ و مێشك و لەش وا هەموویان بەیەکەوە تێکەڵن، لە جێگەی جۆجۆیدا نەبەستراونەتەوە، بێ گومان یەك میلیون ساڵی تریش هەر ئاوا دەبن، شێوی باش بۆقسە لەسەرکردنیکی باش بایەخێکی زۆری هەیە. ئەگەر کەسێك شێوێکی باشی نەخواردبێ ناتوانێ باش بیر بکاتەوە، باش خۆشەویستی و ئەوین ئاراستە بکات، باش بخەوێت. چرای بڕبڕەی پشت بە گۆشت و هەڵووژە داناگیرسێ. لەوانەیە هەمومان بچینە بەهەشت وهیوادارم لە سەر پێچەکەی تر چاومان بە وەندایك بکەوێت-ئەمە ئەو زەینییەتە باوەر پێ نەکراو و سنووردارەیە وا خواردنی گۆشت و هەڵووژە لەکۆتایی رۆژێك کارکردندا تیاماندا ساز دەکات. بەختەوەرانە هەڤاڵەکەی من، وا وانەی زانستی دەگوتەوە، سندوقێکی بوو کە بتڵێکی خرپن و چەند پەرداخێکی بچووکی تێدا بوو، بەڵام دەبوو بە ماسی سۆل و کەو دەستی پێبکردایە. ئا بەو جۆرە توانیمان لە پەنا ئاور دابنیشین و هەندێ لە زەرەرەکانی ئەو رۆژەی ژیانمان قەرەبوو بکەینەوە. بە مەودای یەك دوو خولێك، بە ئازادی لەم چڵەوە دەپەڕینە سەر ئەو چڵ و سەبارەت بەو بابەتانە قسەمان دەکرد وا پێمان خۆش بوو ئەو خۆتێهەلقورتاندنانەی وا ئەگەر کەسێکی تایبەت دیار نەبێ لە مێشکدا ساز دەبن. ئەو کاتەی دیسان یەکتر دەبینینەوە، دیارە دەبنەوە بابەتی قسە کردن. ئەوەی کە چلۆن فلانە کەس زەماوەندی کردووە، ئەوی تر ماوەتەوە یەکێك ئاوا بیر دەکاتەوەو، ئەویتر ئاوا ئەو کەسەیان بەڕای هەموان چاتر بووەو، ئەویتر بە جۆرێکی سەرسووڕهێنەر خراپ هاوڕێ لەگەل هەمو چەشنە گومانێك سەبارەت بە سریشتی مرۆڤ و تایبەتمەندی ئەو جیهانە سەرسووڕهێنەرەی تێیدا دەژین، دیارە لە ناخی قسەگەلێکی ئاوەها سەرەتاییەوە دێنە دەر. بەڵام ئەو کاتەی ئەو قسانە لە زار دەهاتنە دەر، تەریق بوومەوە کە سەرنجم بەو کەشە تایبەتەدا وا گشت شتەکانی ئاراستەی

46-Trinity
47-Somerville
48-Girt on
49-New ham
50-Christchurch

مەبەستەکانی خۆی دەکرد. لەوانە بوو لەبارەی پورتەغاڵ یان ئیسپانیاوەوە قسان بکەین، یان لەبارەی کتێبەوە یان کێ بەر کێی غارغارێنی ئەسب، بەڵام لە راستیدا بابەتی جێگەی سەرنج هیچ کام لەوانە نەبوو، بەڵکوو دیمەنێك بوو لە بەنناکانی سەر بانە بەرزەکەی دەورووبەری پێنج سەدە لەمەوپێش. پاشاکان و سەرۆکەکان گەنجینەکانیان لە توورەکەی گەلێ گەورەدا دەهێنا و دەیانخستە ژێر عەرزی. ئەم دیمەنە پەیتاپەیتا دەهاتەوە بەر چاوم ودەچووە پەنا دیمەنێکی دیکە، دیمەنی مانگا لەڕەکان و بازاری قوڕاوی و سەوزی رزیو و دڵی ریشاڵ ریشاڵی پیاوانی بەساڵاچوو-هەر چەندە، هەردەم ئەم دوو وێنەیە بەبێ پێوەندی و ناڕێکوپێك و بێ واتا، پێکەوە وەدیار دەکەوتن و بە یەکەوە شەڕیان دەکرد، مێشکمیان تەواو داگیر کردبوو. باشترین رێگە ئەوە بوو-مەگین بڕیار وا نەبووبێ باسەکە تەواو لە بەستێنی خۆی بترازێ-کە وا ئەو شتەی لە مێشکمدایە هەڵیڕێژم بەڵکە شانسەکەم بیگرێ و ئەم دیمەنانە لەبەر چاوم بڕەوێنەوە، وەك سەری پاشای کۆچکردوو ئەوکاتەی تابووتەکەیان لە وینزەر"[51]"هەڵداوە، هەپرون بە هەپرون بوو."[52]"بۆیە بە کورتی لەگەڵ مێری باسی ئەو بەننایانەم کرد وا چەندها ساڵ لە سەربانی کلیسا بوون، هەروەها باسی پاشایان و شاژنان و گەورە پیاوان وا توورەکەی زێڕ و زێویان بە باوەش دەهێنا، و دەیان نا چاڵ پاشان سەبارەت بەوەی چلۆن ئەم کەڵە سەرمایەدارانەی سەردەمی ئێمە هاتن و چەك و بەرگەی بەشداریەکانیان، پێموایە، لەو جێیانە دادەنا وا ئەوانی تر کەستەك و زێڕی گەورە گەورەیان لێ دادەنا. گوتم هەمویان لەوێ لەبن ئەو کۆلێژانەدا لەچاڵدان بەڵام چ شتێك لەم کۆلێژەی وا ئێستا لێی دانیشتووین لە ژێر ئەو خشتە سوورە بەشکۆ و گژوگیا کێوی و ناڕێکوپێکانەی باخچەکەدا شاردراوەتەوە؟ چ هێزێك لەوبەری ئەو کەل و پەلە چینییە سادانەوەیە وا شێومان تێدا خواردن؟ و (لەم کاتەدا، بێ وەی بتوانم زمانم رابگرم، ئەم وشانەم لە زار دەرپەڕیە دەر) لەو بەری گۆشت و کاستێرد و هەڵووژەوە؟

مێری سیتۆن گوتی، دەی جا، ئەوە دەوروبەری ساڵی ١٨٦٠ بوو، بەڵام خۆ تۆ چیروکەکە دەزانی-پێموایە ئەم راپۆرتە وەڕەزی کردبوو. ماڵێکیان بە کرێ گرت. رێکخراوەکان داندران. لەپشت پاکەتەکان نیشانی نووسران. ئاگاداریەکان ساز کران. دانیشتنەکان بەڕێوە چوون، نامەکان خۆیندرانەوە، فلانە کەس وەئەستۆی گرت ئەوندە پارە بدات کەچی ئاغای... پاوەندێکیش نادات.

---

51-Windsor

٥٢- لەوانەیە مەبەستی وۆڵف چارلزی یەکەم بێ وا شوڕشگێڕان سەریان لێ کردەوەو پاشان مەیتەکەیان لە تابووتێکدا بەمەبەستی ناشتن ناردەوە بۆ وینزر. وف

ساتێردەی ریڤیو"[٥٣]"زۆری بێ چاوەڕوانی کردوە. چۆن دەتوانین پارە بۆ خەرجەکانی نوسینگەکان کۆوە کەین؟ دەبێ بازاڕی خێرو خێرات دابنێین؟ ناتوانین کیژۆڵەیەکی جوان بدۆزینەوە بۆ وەی لەڕیزی پێشەوە دابنیشێ؟ ڕاوەستن با بزانم جان ئیستوارت میل"[٥٤]" سەبارەت بەم بابەتە چی گوتوە. کەس دەتوانێ سەرنووسەری... قاییل بکات کە نامەیەك بلاو بکاتەوە؟ دەتوانین داوا لە خاتوو... بکەین واژووی بکات؟ خاتوو... لە سەفەرە. پێموا شەست ساڵ لەوەپێش کار ئاوا دەکرا، و پێویستی بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر و گەورە بوو، کاتێکی یەکجار زۆری بۆ تەرخان دەکرا. وە لە پاشی خەباتێکی دوورودرێژ و شەڕەدەندووکێ لەگەڵ کێشەگەلێکی دژوار تاقە سی هەزار پاوەندیان کۆ کردەوە."[٥٥]"مێری سیتۆن گوتی کەواتە بە دڵنیاییەوە ناتوانین شەراب و کەومان هەبێ، و ئەو خزمەتکارانەی قاپەکان لە سەر سەریان دانێن. ناتوانین موبل و ژووری جیاشمان هەبێ. پاشان لە زاری کتێبێکەوە گوتی: «بۆ کەل و پەلی ئاسایش جارێ دەبێ چاوەڕوان بین."[٥٦]"

بیر کردنەوە لەو هەموە ژنەی وا لەم ساڵەوە بۆ ساڵێتر کاریان دەکرد و بۆیان جێ بە جێ نەدەبوو دوو هەزار پاوەند لەسەر یەك کۆ کەنەوە، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریان دەدا تا سی هەزار پاوەند کۆ کەنەوە، چاکی پەشۆکاندین و هەژاری شەرم هێنی جنسیەتی خۆمانمان سەرکۆنە کرد. ئەگەر وایە دایکانی ئێمە چیان دەکرد وا هیچ سەروەت و سامانێکیان نەبوو تا بۆمان بەجێ بێڵن؟ لووتیان چەور دەکرد؟ چاویان لە جامخانەی دووکانەکان دەکرد؟ خۆیان لەبەر هەتاوی مۆنت کارلۆ دەنواند؟ چەند وێنەیەك لەسەر تاقەکە بوون. دایکی مێری —ئەگەر ئەو وێنەیە هی ئەوبێ-ڕەنگە لە کاتی بێکاریدا کەسێکی تەوەزل بووبێ(لە قەشەیەکی کلیسا سێزدە منالی هەبوو)، بەلام ئەگەر وابووبێ، ژیانە سەرخۆشانە و حولحولیەکەی شۆینەوارێکی بچووك و نادیاری لە چێژ بە سەر ڕوخساریەوە دادەنا. ڕووالەتێکی زۆر ئاسایی هەبوو، خانمێکی بەسالاچوو شالێکی سکۆتلەندی پێوە

---

53-Saturday Review

54-John Stuart Mill

٥٥- «پێیان گوتوین دەبێ لانی کەم داوای سی هەزار پاوەند بکەین... لەچاو ئەوەی بڕیار وایە تاقە یەکدانە کۆلێژی لەو جۆرە بۆ بریتانیای مەزن، ئیرلەند، و ولاتانی بن دەس دروست بکرێت، دیسان لە چاو ئەوەی کە کۆ کردنەوەی پوولێکی زۆر بو قوتابخانەی کوڕانە کارێکی گەلێك ئاسانە، ئەم پوولە، پارەیەکی زۆر نیە. بەلام لەچاو ئەوەی کە هەندێکی زۆر کەم بەڕاست پێیان خوشە ژنان دەرس بخۆینن، پارەکە زۆرە. (Lady Stephen, Life of Miss Emily Davies)

٥٦- «گشتی ئەو پارەیەی وا بەو زەحمەتە زۆرە کۆ ببوەوە تا پێنی ئاخری بۆ بینای (کۆلێژەکە) خسترابوە ئەولاوەو، دابینکردنی کەل و پەلی ئاسایش دەبوو وەدوا بکەوتایە. (R. Strachey,The Cause)

بوو به نقێمێکی قوبگەدار داخرابوو، لەسەر کورسیەکی حەسیری دانیشتبوو، سەگە ئیسپانیلیەکەی"[٥٧]"هان دەدا بۆوەی چاو لە کامێراکە بکات-بە قیافەیەکی سەرسوورماو بەڵام قەڵسی کەسێکەوە کە دڵنیایە لەوە وا هەر چراکە داگیرسێ سەگەکە دەجولێ. ئەگەر بچوایەتە ناو جیهانی بازرگانییەوە دەبووە بەرهەم هێنی هاورێشمی دەسکرد، یان لەبازاڕی بورسدا دەبووە کەسێکی گەورە، ئەگەر دوسەد سێسەد هەزار پاوەندی بۆفرێنهام دابنابایە، ئێمە دەمانتوانی ئەمشۆکە بە ئاسودەیی دابنیشین و سەبارەت بە کەوناراناسی، روەکناسی، مرۆڤناسی، فیزیك، ماهیەتی ئەتۆم، بیرکاری، هەسارەناسی، نیسبیەت و جۆغرافیا قسە بکەین. ئەگەر هەر تەنیا خاتوو سیتۆن و دایکی و دایە گەورەی فێری هونەری مەزنی پارە دەرهێنان بووبایەن و پارەکەیان وەك باب و باپیرانی خۆیان، بۆ دامەزراندنی کورسی ئوستادی و لێکۆڵینەوەو خەڵات و بورس بو کەڵك وەرگرتنی ڕەگەزی خۆیان دابنایە، لەوانەیە ئێمە بمانتوانیایە بۆ شێوێکی دوو کەسی لەم شووشەیەك شەراب بخۆین، ڕەنگە بمانتوانیایە بێ لەخۆڕادیتنێکی بێجێ، بە هیوای ژینێکی خۆش و سەربەرزانە لە سایەی دانەیەك لەم پیشانەی بە یارمەتی ئەوان پێك هاتبوو ببین ڕەنگە بمانتوانیبایە خەریکی لێکولێنەوە بین یا وەکو بنووسین لە شۆینە پیرۆزەکانی سەر زەوی بخولێینەوە لە سەر پلیکانەکانی پارتێنۆن"[٥٨]"خەریکی بیر کردنەوە بین، یان کاتژمێر دە بچینە نووسینگەی کار و کاتژمێر چوارو نیو بە خەیاڵێکی ئاسودە بگەڕێینەوە ماڵێ تا چەند هۆنراوە بهۆنینەوە. هەر ئەوندە ئەگەر خاتوو سیتۆن و هی وەك ئەو لە پازدە ساڵیدا بچوونایە جیهانی تیجارەتەوە. -بەڵگە هێنانەوەکەی ئێمە ئالێرەدا پەکی کەوتبوو- ئیتر مێری نەدەبوو. ڕای مێریم لەو بارەیەوە پرسی. لە نێوان پەردەکانەوە شەوی ئۆکتۆبەر خۆی وەدەرخست، هێور و خۆش، بە یەك دوو هەسارەوە وا لە نێو دارە بێ گەڵاکاندا گیریان کردبوو. ئایا مێری ئامادە بوو بۆوەی لە بەشەکەی خۆی لەو شەوە خۆش بێ. هەروەها لە بیرەوەرییەکانی (لەبەر وەی ئەوان لە چاو ئەوەی بنەماڵەیەکی خێزاندار بوون، بەختەوەر بوون)، لە شەڕو کایەکانیان لە سکۆتلەند، کەوا لەوەی کە بە سەر کەیکە بەتام و هەوا خۆشەکەیدا هەڵبلێت قەت هیلاك نەدەبوو، تاوەکوو فرێنهام بە قەڵەم لەسەر قاقەز دانانێك دەورو بەری پەنجا هەزار پاوەندی پێ ببڕێ؟ دابینکردنی خەرجەکانی کۆلیژ گشت ئەندامانی بنەماڵە دەخاتە زەحمەتەوە. دەوڵەمەند بوون و سێزدە منالێ لە دایك بوون، هیچ کەسێك پێی نەدەکرا. گوتمان با بێین و ڕاستەقینەکان لەبەر چاو بگرین. سەرەتا نۆمانگی پێ دەچێت تا منداڵەکە لەدایك دەبێت. پاشان منداڵەکە لە دایك دەبێ. لەدوای ئەوە، سێ یا چوار مانگ بە

57-Spaniel
58-Parthenon

شیرپێدانی منداڵەکەوە دەڕوا. پاش شیر دان، بێگومان پێنج ساڵێك بە کایەکردن لەگەڵ منداڵەکە تەرخان دەکرێت. وادیارە ناتوانین لێگەڕێین منداڵەکان لە شەقامان بخولێنەوە. ئەو کەسانەی لە رووسیە ئەوانیان لە سەر شەقامەکان دیوە دەڵێن دیمەنێکی جوانی نییە. جگە لەمە دەڵێن زاتی مرۆڤ لە نێوانی یەك تا پێنج ساڵیدا بیچم دەگرێت. گوتم ئەگەر خاتوو سیتۆن خەریکی پووڵ پەیداکردن بووایە، تۆ چ جۆرە بیرەوەرییەکت لە کایە و شەڕەکان دەبوو؟ چیت لە کەیکە بەتامەکان و هەوا خۆشەکەی سکۆتلەند و شتەکانی تر دەزانی؟ بەڵام پرسینی ئەم جۆرە پرسیارانە لەخۆڕاییە، لە بەروەی تۆ هەر لە دایك نەدەبووی. جگە لەمە،کردنی ئەم پرسیارەش هیچ سوودێکی نییە کە وا چی دەبوو ئەگەر خاتوو سیتۆن و دایکی و دایەگەورەی ماڵێکی زۆریان لەسەر یەك دابنایا و ئەویان بخستایەتە بن بناغەی زانکۆ و پەرتووکخانە، لەبەر وەی لە قۆناغی یەکەمدا، وەرگرتنی داهات بۆوان مەحاڵ بوو، لەقۆناغی دووهەمدا، ئەگەر بشکرابایە، یاسا ئەوانی لەمافی خاوەنبوونی داهاتەکەیان بێبەش دەکرد. تاقە لەم چل و هەشت ساڵەی دواییدا خاتوو سیتۆن بڕە پارەیەکی خۆی هەبووە. بەدرێژایی هەموو ئەو سەدانەی بەر لەوە، ئەم پارەیە هی مێردەکەی بووە. –ئەو پرسەی وا لەوانەیە دەوری هەبووبێ لە دوور ڕاگرتنی خاتوو سیتۆن وئەژدادی دایکی لە بازاڕی بورس. ڕەنگە بیانگوتایە ئەو پووڵەی من دەری دەهێنم تا دواپێنی لێمی وەردەگرن و لە ژێر چاوەدێری مێردەکەم خەرج دەبێ. لەوانەیە بۆ بەخشینی بورسی خوێندن یان دامەزراندنی کورسی ئوستادی لە بالیۆل"[٥٩]" یان کینگز"[٦٠]". کەواتە پووڵ دەرهێنان، تەنانەت ئەگەر بۆشم بکرێ، بابەتێکی وا نییە کە زۆرم بۆ سەرنجڕاکێش بێ. باشترە بیدەمە دەس مێردەکەم.

هەرچۆنێك بێ، چ ئەو خاتوونە بە ساڵا چووە وا چاوی بڕیبوە سەگە ئیسپانیلەکە تاوانبار بێ و چ نا، گومانی تێدا نییە کە دایکانی ئێمە لەبەر هەر هۆیەك بێ کارەکانی خۆیان باش بەڕێوە نەبردووە. نەدەکرا تەنانەت پێنییەکیش بۆ «کەل و پەلی ئاسایش» تەرخان بکرێ، بۆ کەیك و شەراب، کارمەند و چیمەن، پەرتووك و جگەرە، پەرتووکخانە و سەرقاڵی. ئەوپەڕی ئەو کارەی لە دەستیان دەهات چێکردنی دیوارێکی ڕووت لەسەر عەرزی ڕەق بوو.

بۆیە لەبەر پەنجەرەکە ڕاوەستاین و قسەمان کرد، لە کاتێکدا کە وەك هەزاران کەسی تر چاومان لە گومبەزی و بورجەکانی ژێر پێمان دەکرد. لە ناو شەتاوی پاییزدا، زۆر جوان بوو، زۆر ڕەمزاوی بوو. وەك بەردێکی زۆر سپی و موتەبەڕکی قەدیمی دەهاتە بەرچاو. مرۆڤ دەکەوتەوە بیر ئەو گشتە کتێبەی وا لەو ژێرە کۆ ببوونەوە. وەبیر وێنەی ئۆسقۆف و کەسە ناودارە کانی ڕابردوو

---

59-Balliol
60-Kings

دەکەوتەوە وا بە قاپی گەچکاریکراوی دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون، وەبیر پەنجەرە ڕەنگاوڕەنگەکان وا وێنەی گۆ و نیوەگۆی سەیریان دەخستە سەر پیادەڕەوەکە وەبیر سواڵەت و بینای یادبوود و نووسراوە کۆنەکان وەبیر فەوارە و چیمەنەکان وەبیر ژووری بێ دەنگ وا دەکەوتنەوە سەر حەوشە چوار سووچ و بێدەنگەکان. وە هەروایش (هەڵبەت داوای لێبووردن دەکەم لەبەر ئەم بیرۆکەیە)وەبیر جگەرە و شەرابی باش و موبلی ڕاحەت و فەرشی نەرم وەبیر ژیانی شار و هاودڵی و تەبایی، ئەو پلە و پایە و مەزنایەتیەی وا لە ناخی ئاسایش و تەنیایی و کەشێکی باشدا پێك دێت. خاترجەم دایکانی ئێمە شتێکی وایان پێ نەدابووین تاوەك لەگەڵ ئەم گشتە بەراورد بکرێت. دایکانی ئێمە وا کۆکردنەوەی سی هەزار پاوەندیان بۆ جێبەجێ نەدەبوو، دایکەکانمان وا سێزدە منداڵیان بۆ قەشەکانی ئێستئەندرێوز"[٦١]" دەبوو.

گەڕامەوە موسافیرخانەکەی خۆم، بەدەم پیاسەکردنم لە شەقامە تاریکەکاندا کەوتبوومە بیرکردنەوە لەم بابەت و لەو بابەت، بەو جۆرەی وا مرۆڤ لە کۆتایی ڕۆژێکی پڕ کاردا ورد دەبێتەوە لە شتەکان. بیرم لەوە کردەوە بۆچی خاتوو سیتۆن پارەیەکی نەبوو تاوەك بۆمان جێ بهێڵێت وە هەژاری چ شوێنێك لەسەر زەین دادەنێت ماڵ و سامان چ کاریگەرییەکی دەبێ بیرم لەو پیاوە پیرە نەجیب و سەیر و بلیمەتانە دەکردەوە وا ئەو بەیانییە دیبوومن و ملپێچێکی تووکیان بەسەر شاندا دابوو وەبیرم هاتەوە وا ئەگەر فیتوویەکت لێبدایە، یەکیان هەڵدەهات وەبیر ئەو ئۆرگە کەوتمەوە وا لە کلیسا دەینەڕاند وە بیر دەرکە داخراوەکانی پەڕتووکخانە بیرم لەوە کردەوە چەندە ناخۆشە مرۆڤ لە پشت دەرکە بمێنێتەوە لەبەر خۆمەوە گوتم لەوانەیە بەسترانەوە لەناو خانوویەکدا لەوەش ناخۆشتر بێت بیرم لە ئاسوودەیی و ئاسایشی ڕەگەزێك و نەبوونی ئۆقرە و نەحەسانەوەیی بۆ ڕەگەزێکی تر کردەوە هەروا لە کاریگەرییەتی نەریت و نەبوونی نەریت لەسەر زەینی نووسەر لە کۆتاییدا بیرم لەوە کردەوە وا کاتی ئەوە گەیشتووە تۆخە چرچەکەی ڕۆژ بە هەموو هۆهێنان و تێگەیشتنەکان و ڕق و پێکەنینەکانییەوە بپێچمەوەو حەوای دەم. هەزاران هەسارە لەناو ئاسمانی ئاوی بەریندا دەتروسکانەوە. دەتگوت لەگەڵ کۆمەڵێکی ڕەمزاویدا بە تەنێ مابوومەوە. گشت مرۆڤەکان نوستبوون- لەپەوڕوو، ڕاکشاو، بێدەنگ. دەتکوت هیچ کەسێك بە شەقامەکانی ئاکسبریجدا هاتوچۆی نەدەکرد. تەنانەت دەرکی هۆتێلەکەش بە وێکەوتنی دەستێکی نادیار کراوە-کەس چاوەڕووانم نەبوو تا بەرەو ژوورەکەم ڕێنوێنیم کات، زۆر درەنگ بوو.

---

61-St. Andrews

# بەشی دووهەم

دیمەنەکە، ئەگەر بتوانم داواتان لێبکەم تا ببنە هاوڕێم، ئێستەکە گۆڕابوو. گەڵاکان هێشتا دەوەرانە سەر عەرزی، بەڵام ئەمجارەیان لە لەندەن نەك لە ئاکسبریج و دەبێ داواتان لێبکەم دیوێك وەك هەزاران دیوی دیکە بهێننە بەرچاوتان، بە پەنجەرەیەکەوە وا کڵاوەکانی خەڵکی و وانێت و سەیارە و پەنجەرەکانی تری لێوە دیار بوو، و لاپەڕەیەکی سپی لە سەر مێزی ناو ژوورەکە دانرابوو وا لە لاسەرووەکەی بە پیتی گەورە نووسرابوو ژن و چیرۆك، هەر ئەوندە و بەس. وادیارە بە داخەوە ئەو شتەی بە دووی خواردنی نیوەڕۆ و شێوی شەوی ئاکسبریجدا دێت و ناشتوانی خۆتی لێ کەڕکەی چاو پێکەوتنی مۆزەی بەریتانیایە. لە ناو کۆی ئەو تێگەیشتنانە ئەوی وا تاکە کەسی و بەختەکی بوو دەبوو وەدەر بهاویشترایە تا ببوایەتە ئاوی بێ خڵت و توخمی پەتی حەقیقەت. لە بەر وەی چاوپێکەوتنەکەی ئاکسبریج، و خواردنەکەی شێوی نیوەڕۆ و شەو، کۆڵێك پرسیاری لەسەر زەینی من کەڵەکە کردبوو. بۆچی پیاوان شەرابیان ئەخواردەوە و ژنان ئاو؟ بۆ چی ڕەگەزێك هێندە دەوڵەمەند بوو ئەویتر هێندە هەژار؟ هەژاری چ کاریگەرییەکی دەبێ بە سەر چیرۆکەوە؟ چ بارودۆخێك پێویستە بۆ ئافراندنی بەرهەمگەلی هونەری؟ هەزار دانە پرسیار پێکەوە هێرشیان دەکردە سەر زەینم. بەڵام من پێویستم بە وڵام بوو نەك پرسیارو وڵامیش هەر بە ڕاوێژکردن لەگەڵ زانایانی بە ئینساف و بێ خەل و خەوش وەچنگ دەکەوت، لەگەڵ ئەوانەی وا خۆیان لە شەڕەقسە و شێواوی جەستە پاراستبوو و ئەنجامی هۆهێنان و لێکۆڵینەوەکانی خۆیان لە کەتێبگەلێکدا بڵاو کردبووەوە کە لە مۆزەی بەریتانیادا وەدەست دەکەوتن. بەدەم هەڵگرتنی دەفتەرچە و قەڵەمەوە، لە خۆمم پرسی ئەی ئەگەر حەقیقەت لە قەفەسەکانی مۆزەی بەریتانیادا نەبینییەوە، دەبێ لە کوێ بێ؟

ئاوەها بە دەستی پڕ، بەم چەشنە خاترجەم و بە دوواچوو، کەوتمە شۆین حەقیقەت. هەوا، هەرچەندە بارانی نەبوو، بەڵام تاریك و دڵتەنگ بوو شەقامەکانی دەوروبەری مۆزە پڕ بوون لە چاڵەی ڕەژی وا تەلیسە ڕەژی لێ هەڵدەڕێژن. داشقەکان بە دووی یەکدیدا دەهاتن و سندووقی بە پەت پێچراویان لە پیادەڕۆکان بەتاڵ دەکرد، ئەو سندووقانەی وا لەوانەیە گشت جل و بەرگی بنەماڵەیەکی سوییسی یان ئیتالیاییان لە خۆگرتبێ وا بە دووی دەوڵەمەندی یان پەناگایەك یان

هەر شتێکی باشی دیدا دەگەڕان کە زستانان لە پانسیۆن و حەواوگەکانی بلۆمێزبێری وەدەست دەکەوێ. هەر هەمان ئەو پیاوانەی وا هەمووکات بە دەنگی خڕەخڕ و داشقەی پڕ لە گوڵدانەوە بە شەقامەکاندا بە ڕێژە دەڕۆیشتن. هەندێکیان دەیانگوڕاند هەندێك گۆرانیان دەگوت. لەندەن لە کارخانەیەك دەچوو. لە سەیارەیەك. هەمووممان لە سەر ئەم پێکهاتە سادەیە بە خێرایی بەرەو دوواوە دەڕۆیشتین و بەرەو پێش پاڵمان پێوە دەنرا تاوەکو جێ پێیەك بەجێ بهێڵین. مۆزەی بەریتانیا بەشێکی تر لەم کارخانەیە بوو. دەرکە باوەشێنییەکان کرانەوە لەوێ، لە ژێر ئەو گومبەزیە گەورەیەدا، دەتکوت مرۆڤ بیرۆکەیەك بوو لەو بەری نێوچاوانێکی بەرز و بێ تووکەوە وا شریتێکی پڕ لە نێوی بەناوبانگ و زۆر و بەشکۆی بە دەوراندەوردا پێچراوە. بەرەو پێشخانەکە دەچووی، دەستت دەدا لەتە قاقەزێك، جلدێکت لە پێڕستەکە دەکردەوە و..... ئەم پێنج خاڵە نیشانەی پێنج خولی جیاجیای سڕی، سەرسووڕماوی و سەرلێ شێواویە. هیچ دەزانن لە ساڵێکدا چەند کتێب سەبارەت بە ژنان دەنووسرێ؟ هیچ دەزانن چەند دانە لەم کتێبانە پیاوان دەیان نووسن؟ هەواڵتان لەوە هەیە کە وا لەوانەیە سەبارەت بە ئێوە پتر لە هەر ئاژەڵێکی تر لەم جیهانەدا قسان بکرێت؟ ئینجا من بە دەفتەرچە و قەڵەمێکەوە هاتبووم تاوەك ڕۆژێك بۆ خوێندنەوە تەرخان بکەم، بەو بۆچوونەوە کە لەوانەیە لە کۆتایی ڕۆژەکەدا حەقیقەتم قۆستبێتەوە ناو دەفتەرچەکەی خۆم. پێموابوو بۆ وەی ئەم کارەم پێ جێبەجێ بکرێ دەبێ گاڕانێك فیل بم یان کۆلێك جاڵجاڵووکە-لە حەیبەت داماوی ئاماژەم بەو ئاژەڵانە کرد وا بە تەمەنی درێژ و چاوی زۆر ناوبانگیان هەیە. تەنانەت بۆ چوونە ناوی ئەم پێستەیە پێویستم بە پەنجەی پۆڵا و دەندوکی برنجین هەبوو. لە خۆمم پرسی چلۆن دەتوانم زەررەکانی حەقیقەت لە ناو ئەم هەمووە قاقەزەدا ببینمەوە. بە نا ئومێدیەوە چاوێکم خشاند بە پێرستە دوورو درێژەکەی بابەتەکان لە سەرەوە تا خوارێ. تەنانەت بابەتی کتێبەکانیش منیان دەخستە ناو فیکرەوە. ئەوەی ئاساییە جنسیەت و سریشتەکەی پزیشکان و ژینناسان بۆ لای خۆی ڕاکێش دەکات، بەڵام ئەو ڕاستەقینەی وا سەرسووڕهێنەر بوو، و شی کردنەوەکەی دژوار ئەمە بوو کە جنسیەت-واتە ژن- سەرنجی نامیلکەنووسانی باشیشی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا هەروەها ڕۆماننووسانی کارامەش، پیاوگەلێکی گەنج وا خوێندەواری لە ئاستی باڵایان هەیە، پیاوانێك وا هیچ شەهادەیەکیان نییە، و پیاوانێك وا شیاوی هیچ نین جگە لەوەی کە ژن نین. هەندێك لەم کتێبانە بە ڕواڵەت ڕووکەشانە و پڕوپوچ بوون بەڵام، لە لایەکی ترەوە، زۆربەیان شێلگیرانە و مانادار، ئەخلاقی و نەستەق بوون. هەر خوێندنەوەیەکی ڕووتی ئەم بابەتانە، مامۆستایان و قەشەگەلێکی بێ ژووماریان دەخستەوە یاد وا لە کۆرسی وانە و خیتابە و وەعزەکانیاندا درێژ

دادپەیەکیان لە ڕادەی ئاسایی کاتژمێرێك گوتەبێژی سەبارەت بە بابەتێکی تایبەت تێدەپەڕی. دیاردەیەکی یەکجار سەیر بوو و بە ڕواڵەت — لەم کاتەدا گەیشتمە پیتی میم-دیاردەیەك تایبەتی جنسیەتی نێر. ژنان سەبارەت بە پیاوان کتێب نانووسن-ئەو ڕاستەقینەیەی وا بە هەر جۆرێك بێ بووە هۆی ئاسوودەیی خەیاڵم. -لەبەر وەی ئەگەر ناچار بووایەم هەر شتێك وا پیاوان لە بارەی ژنانەوە نووسیویانە بیخۆینمەوە، پاشان هەر شتێك وا ژنان سەبارەت بە پیاوان نووسیویانە، بەر لەوەی قەڵەم لە سەر قاقەز دانێم گیای زەردی سەبر وا هەر سەد ساڵ جارێك گوڵ دەکات دوو جاری گوڵ کردبوو. کەواتە بە تەواوێت لە ڕووی هەڵکەوت و پێ خۆشبوونەوە، دە دوازدە کتێبم هەڵبژارد، گەڵاکانم لە سەر کەشەفە تەلیەکە دانا، و لە سەر جێگەی خۆم لە نێو ئەو کەسانەی تر وا بە دووی توخمی خەست و ڕووتی حەقیقەتدا دەگەڕان چاوەڕوان مام.

بەدەم گێڕانی چەرخە دەستیەکە بەسەر ئەو لەتە قاقەزانەی کە ماڵیاتدەرە ئینگلیسیەکان بۆ ئامانجگەلی تر دابینیان کردبوو، پرسیارم لە خۆم دەکرد، ئەم جیاوازیە سەیرە چ هۆیەکی دەتوانێ هەبێ. بۆ چی ژنان، بەو جۆرەی ئەم پێڕستە نیشانی دەدات، ئەوندە بۆ پیاوان سەرنجڕاکێشترن تاوەك پیاوان بۆ ژنان؟ بە ڕواڵەت ئەم پرسە زۆر سەیر بوو، بە وەبەر چاو هێنانەوەی ژیانی ئەو پیاوانەی وا کاتی خۆیان بۆ نووسینی کتێب سەبارەت بە ژنان تەرخان کردووە سەرم سووڕما. بەساڵاچوو بوون یان گەنج؟ هاوسەردار بوون یا سەڵت؟ لووتێکی سووریان هەبوو یان پشتیان کووڕ بوو؟ هەر چۆنێك بێ، کەم و زۆر خۆش بوو ئەوەی کە ئاوا خۆت لە بەر چاو و جێگەی سەرنج ببینی، بەو مەرجەی ئەم سەرنج پێدانە هەر تەنیا لە لایەن مرۆڤگەلێکی بێ دەسەڵات و ناکارامەوە نەبێ. -لەم خەیاڵانەدا بووم کە بە هەڵڕژاندنی دەریایەك کتێب لە سە مێزەکەی بەرامبەرم گشت ئەم بیرۆکە قۆڕانە کۆتاییان پێهات. کێشەکە تازە دەستی پێکرد. ئەو خۆیندکارەی وا شێوەی لێکۆڵینەوە لە ئاکسبریج فێر بووە، بێ گومان بۆ ڕێنوێنیکردنی پرسیارەکەی خۆی لە نێو ئەم هەمووە شێواویەدا ڕێوشۆینێکی هەیە، تا هەر وەك چۆن مەڕ دەگەڕێتەوە ناو ئاخوڕ پرسیارەکەش بگات بە وڵامەکەی خۆی. بۆ وێنە، دڵنیا بووم لەوە ئەو خوێندکارەی وا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، شێلگیرانە و بە پێداگریەوە خەریکی لەبەرگرتنەوەی کتێبێکی ڕێنوێنی زانستی بوو، نزیکەی هەر دە خول جارێك چەند لەتی بێ خەوشی لە زێڕە پەتیەکە دەردەهێنا. لە ئەهانێ گوتنەکەی ڕا دیار بوو قابیلە لە کارەکەی. بەڵام ئەگەر بێتوو کەسێك بە ئەو پەڕی داخەوە هیچ ڕاهێنانێکی لە زانکۆ نەدیتبێ، پرسیارەکە لە جیات ئەوەی بەرەو ئاخوڕەکەی بچێ، وەك مێگەلێکی تۆراو وا کۆمەڵێك سەگی ڕاو ڕەپێیان ناوە، سەرلێ شێواو بەم لا و ئەو لادا ڕا دەکات. ئوستادان، مامۆستایان، کومەڵناسان،

قەشەکان، رۆماننووسان، نامیلکەنووسان، ڕۆژنامەوانان، ئەو پیاوانەی وا شیاوی هیچ نەبوون جگە لەوەی کە ژن نەبوون، بە دووی پرسیارە سانا و تاقانەکەی مندا —بۆ چی ژنان هەژارن؟ چوبوون. تاوەکوو ئەو پرسیارە بووە پەنجا دانە پرسیار و ئەو پەنجا دانە پرسیارە شێتانە لە ناکاو خۆیان کرد بە رووبارەکەدا و ئاو بردنی. بۆ وەی زەینییەتی ئەو کاتەمتان بۆ بخەمە ڕوو، چەند دانییەکیانتان بۆ دەخوێنمەوە، بەو ڕوونکردنەوەیە کە بابەتی لاپەڕەی نووسیینەکانم هەر ژنان و هەژاری، بە پیتی گەورە، بوو بەڵام ئەوەی وا لە خوار ئەم بابەتەوە هاتبوو کەم و زۆر ئەمانە بوون:

بارودۆخ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

باو و عادەت لە دوورگەکانی فیجی

پەرستن وەك ئیلاهە

لاوازتر لە ڕوانگەی ئەخلاقیەوە

ئارمانج خوازی

ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان بە باشتری

دانیشتوانی دوورگەکانی دەریای باشوور، تەمەنی باڵغ بوون لەو نێوانەدا

پێشکەش کران وەك قوربانی

دلڕفێنی

ڕادەی بچووکی مێشك

نەستی قووڵتر

تووکی کەمتر لە سەر لەش

سووکایەتی جەستەیی، ئەخلاقی و زەینی

عیشق بە منداڵەکانی

تەمەنی درێژتر

ماسولکەی لاوازتر

سۆز و عەواتیفی بە هێز

خۆهەڵکێشان

خوێندەواری باڵا

ڕای شێکسپیر

ڕای لۆرد بیرکەن هێد"[٦٢]"
ڕای دین ئینگ"[٦٣]"
ڕای لابرویر"[٦٤]"
ڕای دوکتور جانسۆن"[٦٥]"
ڕای جەنابی ئۆسکار براونینگ"[٦٦]"

لێرەدا پشوویەکم داوە بەر خۆم و، هەڵبەت لە خوارەوەش، ئەوەم خستە سەری بۆ چی سامۆئێل باتلێر"[٦٧]"دەڵێ: «پیاوانی ئاوەزمەند قەت ڕای خۆیان سەبارەت بە ژنان دەرنابڕن؟ وادیارە پیاوانی ئاوەزمەند شتێك جگە لەمە نالێن. پاڵم دا بە پشتی کورسیەکەی خۆمەوە و چاوم لەو گومەزیە گەورەیە دەکرد وا ئێستەکە لە بنیدا نەك هەر فیکرێکی تاقانە، بەڵکە فیکرێکی سەرلێ شێواویش بووم. بەو حاڵەوە لەبەر خۆمەوە گوتم، ئەو شتەی وا زۆر جێگەی داخە ئەوەیە وا پیاوانی ئاوەزمەند قەت سەبارەت بە ژنان ڕایەکانیان یەك ناخەن. پۆپ"[٦٨]"دەڵێ:

زۆربەی ژنان هەر ئەسڵەن کەسایەتیان نییە.

لابرویر دەڵێ:

ژنان زێدەڕۆن یا زۆر خراترن لە پیاوان یا زۆر باشترن لەوان."[٦٩]"

دژایەتیەکی ڕوون لە گوتەی دوو چاوەدێری زیرەك وا هاوسەدە بوون. ئایا ژنان توانایی دەرس خوێندنیان هەیە؟ بە ڕای ناپلئۆن نەیانبوو. ڕای دوکتور جانسۆن بەپێچەوانەی ئەمە بوو. "[٧٠]"ئایا ژنان ڕۆحیان هەیە؟ هەندێك لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان لە سەر ئەو باوەڕەن کە نیانە.

---

62-Lord Birkenhead
63-Dean Inge
64-La Bruyere
65-Dr. Johnson
66-Oscar Browning
67-Samuel Butler
68-Alexander Pope
69-Les femmes sont extremes elles sont meilleures ou pires que les homes .
٧٠- «پیاوان دەزانن ژنان هاوکێشێکی گەورەن بۆوان، کەواتە لاوازترین و نەزانترینەکانیان هەڵدەبژێرن. ئەگەر وایان بیر نەکردبایاتەوە، قەت لەوە نەدەترسان کە ژنان بە قەرا ئەوان بزانن"... بۆ وەی بێ ئینسافی کردن نەبێ سەبارەت بە ژنان، پێموایە دەبێ بە ڕوونی دان بەوەدا بنێم کە لەو ووت و وێژەی لە دوای ئەوەوە هاتە ئاراوە،

ئەوانیتر، بە پێچەوانە، پێیان وایە ژنان نیوە خودان و لەو سۆنگەیەوە دەیانپەرستن. "[٧١]"هەندێك لە ئاوەزمەندان لە سەر ئەو بڕوایەن وا ژنان لە سۆنگەی زەینییەوە ڕووکەشترن هەندێکی تر دەڵێن لە سۆنگەی ئاگادارییەوە قووڵترن. گوتە ڕێزی لە ژنان دەگرت. موسولینی قینی دنیای لێیانە. چاوت لە هەر لایەك دەکرد پیاوان سەبارەت بە ژنان بیریان دەکردەوە و ڕای جیاوازیان هەبوو. دەفتەرچەکەم بە نووسراوەی شەقلی بە تەقلی و ناکۆکەوە ڕەش ببوەوە. بە ئێرەییەوە چاوێکم لە لێکۆڵەرەکەی پەنا دەستمەوە کرد وا زۆر بە پوخت و پاراوی و ڕێك و پێکی دەینووسی و زۆر جاران لە ڕووی پیتی ئەلفباوە ریزبەندی دەکردن و بەم ئاکامە گەیشتم تێگەیشتن لەم کێشەیە مەحاڵە. دڵەڕاوکێ هێن بوو. سەرەگێژەی پێوە بوو. سووك و چرووکانە بوو. حەقیقەت لە چنگم دەرچوبوو، تا دوایین دڵۆپ.

پێموابوو ڕەنگە نەتوانم بچمەوە ماڵێ و ئەم شتە وەك لێکۆڵینەوەیەکی شێلگیرانە زیاد کەم بە بواری موتالەعەی ژن و چیرۆك کە لەشی ژنان لە چاو هی پیاوان تووکێکی کەمتری پێوەیە ، یان ئەوەی کە تەمەنی بالغ بوونی کچان لە دوورگەکانی دەریای باشوور نۆ ساڵە-یان نەکا نەوەد ساڵ بێ؟ تەنانەت دەست و خەتەکەم لە کەم هۆشیان ناخۆشتر ببوو. مایەی سەرشۆڕی بوو کە پێت نەکرێ لە کۆتایی ڕۆژێك ئیشکردندا شتێکی شێلگیرانەتر و باوەڕپێکراوتر بخەیتەڕوو. ئەگەر نەمدەتوانی سەبارەت بە ژن لە ڕابردوودا بە حەقیقەت بگەم، ئەی بۆ چی سەبارەت بە ژن لە داهاتوودا خۆم بخەمە زەحمەتەوە؟ ڕاوێژکردن لەگەڵ گشت ئەو ئاغایانەی وا پسپۆڕ بوون لە بارەی ژن و کاریگەرییەکەی لە سەر بوارە جۆراوجۆرەکانی — ڕامیاری، زارۆکان، حەقدەست و ئەخلاق- سەرباری ڕێژەی بێ ژمار و خوێندەوارییەکەیان، هەر لاپ وەك بەفیڕۆدانی کاتم وەبەر چاو هات. هەر ئەوە باشتر بوو کە کتێبەکانیان بێ هەڵدانەوە وەلا نێی.

هەر وا کە نوقمی خەیاڵەکانم ببووم، لە جیات وەی کە وەك پەنا دەسەکەم خەریکی نووسینی ئەنجامەکەم بم، بێ وەی ئاگام لە خۆم بێ و بە وەڕەزی و ناهومێدیەوە وێنەیەکم دەکێشاوە.

---

ئەو پێمی گوت کە بە ڕاستی ئیمانی بەو شتە هەیە کە وا گوتویەتی. (Boswell The journal of a Tour to the Hebrides)

٧١- «ئاڵمانیەکانی کەون ئارا بڕوایان وابوو کە شتێکی موقەددەس لە ژندا هەیە هەر بۆیە لە گەڵ ژنان وەك پێشگۆیەك ڕاوێژیان دەکرد. (Frazer Golden Bough)

خەریکی کێشانەوەی ڕوخسار و بەژنێك بووم ڕوخسار و بەژنی پرۆفیسۆر ڤۆن ئیکس"[٧٢]" لە کاتی نووسینی کتێبە گەورەکەی بە سەردێڕی سووکایەتی جەستەیی، ئەخلاقی و زەینی ڕەگەزی مێو"[٧٣]". لە وێنەکەی مندا، بە پیاوێکی خوێن شیرین دانەدەنرا. بەخۆوە بوو چەنەگەیەکی درێژ و چاوانێکی بچوکی بوو دەموچاوی زۆر سوور بوو. لە ڕوخساری وا دیار بوو کە لە ژێر کاریگەری هەستێکدایە وا هانی دەدات تا قەڵەمەکەی وەك خەنجێر بخاتە سەر قاقەزەکە، دەتگوت لە کاتی نووسیندا جرجانەوەر و مێروویەکی لاساری دەکوشت، بەڵام تەنانەت بە کوشتنی مێرووەکەش سوکنایی نەدەهات دەبوو هەر ئاوا ئەو بکوژێ تەنانەت لەم حاڵەشدا هۆیەك بۆ ڤین هەستان و دڵ هێشاوی دەماوە. بەدەم چاولێکردنم لە وێنەکە لە خۆمم پرسی نەکا لە ژنەکەی قەڵس بووبێ. بڵێی ژنەکەی عاشقی ئەفسەرێکی سوارچاکی چەکدار بووبێ؟ ئایا ئەو ئەفسەرە سوارچاکە بەلەباریك و شۆخ و شەنگ بووە و باڵتەی چەرمی هەشتەرخانی لەبەردا بووە؟ ئایا، وەك تیۆرییەکەی فرۆید دەڵێ، ئەو کاتەی لە بێشکەدا بووە کیژێکی جوانکیلە بە ڕوویدا پێکەنیوە؟ لەبەر خۆمەوە گوتم، لەوە ناچێ پرۆفیسۆر هەر لە بێشکەشدا منداڵێکی جوان بووبێ. هۆیەکەی هەر چیەك بێ، پرۆفیسۆر لە وێنەکەی مندا، لە کاتی نووسینی کتێبە گەورەکەی سەبارەت بە سووکایەتی جەستەیی و ئەخلاقی و زەینی ژنان، زۆر تووڕە و زۆر ناحەزیش بوو. وێنە کێشانەوە شێوەیەکی بێ کەڵك بوو بۆ کۆتایی هێنان بە ڕۆژێکی کاری بێ سوود. بەم حاڵەشەوە، لە ناو بێ کەڵکی و خولیا و ڕۆئیای ئێمەدایە وا جاروبار حەقیقەتی شاراوە ئاشکرا دەبێت. بەدەم چاو لێکردنی دەفتەرچەی نووسراوەکانمەوە، مەشقێکی زۆر ئاسانی دەروون ناسی، کە نەدەکرا نێوی پڕبایەخی دەروون شیکاری لە سەر دابنێی، پێی نیشان دام وا وێنەی پرۆفیسۆری تووڕە بە دەم ڕقەوە کێشراوەتەوە. ئەو کاتە وا کەوتبوومە خەیاڵەوە، ڕق قەڵەمەکەی لێ ڕفاندبووم. بەڵام ڕق لەوێ چی دەکرد؟ هۆگری، ڕابواردن، سەرلێ شێواوی، پەژارە-دەمتوانی شوێن پێی گشت ئەم هەستانە وا لە ماوەی ڕۆژێکدا بە دووی یەکدا هاتبوون ببینمەوە و نێویان بێنم. -یانی ڤین، ئەو مارە ڕەشە، لە نێوانیاندا خۆی حەشار دابوو؟ وێنەکە دەیگوت، بەڵێ، ڤین لە حەشارگەدا بووە. و منی بێ یەك و دوو لێکردن بەرەو ئەو کتێبە، ئەو بڕگەیە دەگەڕاندەوە وا شەیتانەکەی ورووژاندبوو، یانی ئەو ڕادەربڕینەی پرۆفسوور سەبارەت بە سووکایەتی جەستەیی و ئەخلاقی و زەینی ژنان دڵمی داخستبوو. گۆنەکانم گڕیان گرتبوو. هێند قەڵس بووم سوور هەڵگەڕابووم. شتێکی هێندە باش و بە هێز نەبوو، هەر

72-Von X
73-The Mental Moral and Physical Inferiority of the Female Sex

چەندە گەمژانەش بوو هەر مرۆڤ پێی خۆش نەبوو ئەوە ببیستێ وا بە زات لە پیاوێکی چرووك سووکترە-چاوم لە خوێندکارەکەی پەنام کرد وا هەناسەی سوار ببوو، بۆینباخێکی هەرزانی لە مل کردبوو، دوو حەوتوویەك دەبوو ڕیشی نەتاشیبوو. هەموو کەسێك لەخۆبایی بوونێکی گەمژانەی تایبەت بە خۆی تێدایە. لەبەر خۆمەوە گوتم ئەمە هەر لە سروشتی مرۆڤدایە، خەریکی کێشانەوەی بازنە و تەگەرێك بووم لە سەر ڕوخساری پرۆفیسۆر تا بووە چڵێکی گرگرتوو یان هەسارەیەکی کلکدار. -هەر چۆنێك بێ، تاپۆیەکی بێ ڕواڵەت یان سریشتی ئینسانی. ئێستەکە ئیتر پرۆفیسۆر شتێك جگە لە کۆمەڵێ کڵپە داری گرگرتوو نەبوو لەسەر هەمپستێد هیت"[٧٤].

هۆی ڕقەکەی من زۆر زوو روون بۆوە بەڵام هەستی وورد بوونەوە هێشتا لە سەر جێی خۆی مابوو. بۆ ڕقی پرۆفیسۆرەکان چ هۆیەك هەبوو؟ بۆ چی قەڵس بوون؟ لەبەر وەی هەرکات سەرەی لێکدانەوەی کاریگەری ئەم کتێبانە دەگەیشت، گشت جارێك عونسووری هەیەجان دەهاتە گۆڕێ. ئەم هەیەجانە بە شێوەی زۆر جۆراوجۆر دەردەکەوت، خۆی لە قەبارەی تەوس، ئێحساسات، هەستی وورد بوونەوە و خراپەبێژی دا وەدەر دەخست. بەڵام توخمێکی تریش لە گۆڕێدا بوو کە زۆر جاران لەوێ بوو کەچی نەدەکرا زوو بیناسیتەوە. من نێوی قینم لێنا. بەڵام قینێکی شاراوە وا خۆی لەگەڵ جۆرەکانی تری ئێحساسات تێکەڵاو کردبوو. لە کاریگەرییەکانیڕا وادیار بوو کە قینێکی گۆڕدراو و تێکەڵ و پێکەڵ بوو، نەك قینێکی سانا و ڕوون و ئاشکرا.

بەدەم چاولێکردنەوەیەکی تری کۆمەڵە کتێبەکەی سەر مێزەکە، بیرم لەوە کردەوە بە هەر هۆیەك بێ گشتی ئەم کتێبانە بۆ مەبەستەکەی من بێ بایەخن. مەبەستم ئەوە بوو کە بایەخی زانستیان نەبوو، بەڵام لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە پڕ بوون لە ڕێکار، شتی سەرنجڕاکێش و پەژارەهێن، و حەقیقەتگەلی سەیر سەیر لە مەڕ عادەتەکانی دانیشتوانی دوورگەکانی فیجی. ئەم پەڕتووکانە لەبەر تیشکی سووری ئێحساساتدا نووسرابوون نەك لەبەر تیشکی سپی حەقیقەت دا. کەواتە دەبوو بیاندەمەوە بە مێزی ئەماناتی پەڕتووکخانەکە تاوەکوو هەر کامەیان بگەڕێننەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان لە ناو ئەو کەندووە گەورەدا. تاقە دەسکەوتی من لە کاری ئەو ڕۆژەم هەر هەمان ڕاستەقینەکەی ڕق و قین بوو. پرۆفیسۆرەکان -ئاوا بەوجۆرە کۆم کردنەوە-ڕقیان هەستابوو. بەڵام بۆچی؟ پاش دانەوەی کتێبەکان لە خۆمم پرسی، بۆچی؟ ئەو کاتەی لە بن ڕیزی دارەکان، لە نێوان کۆترەکان و گەمیەکانی بەر لە مێژوودا ڕاوەستابووم، جارێکی تر لە خۆمم پرسیەوە، ئەوان بۆ وا

---

74-Hampstead Heath

قەڵسن؟ لەو کاتەدا ئەم پرسیارە زەینمی داگیر کردبوو وەڕێ کەوتم تا شوێنێك بۆ نانخواردن ببینمەوە. لە خۆمم پرسی ماهیەتی ڕاستەقینەی ئەو شتەی وا ئێستەکە من پێی دەڵێم قین چیە؟ ئەم مەتەڵە بە درێژایی گشت ئەو کاتەی لە خواردنگەیەکی بچوکی نزیکی مۆزەی بەریتانیا نانم دەخوارد مێشکمی داگیر کردبوو. دانەیەك لە موشتەریەکانی بەر لە من ڕۆژنامەیەکی لە سەر کورسیەکە بەجێ هێشتبوو هەر وا کە چاوەڕوانی خواردنەکە بووم بەبێ مەیلی چاوێکم بە سەردێڕەکانیدا خشاند. بە پیتی گەورە شریتێك پانایی لاپەڕەکەی داگرتبوو. کەسێك لە ئافریقای باشوور کارێکی گرینگی کردبوو. شریتە بچوکترەکان ڕایاندەگەیاند وا سێرئاستەن چەمبێرلین[٧٥] ژنێوە. شەتیرێك وا تووکی ئینسانی پێوە بوو لە ژێرخانێکدا دۆزرابۆوە. جەنابی دادوەر لە دادگاکانی تەڵاق ڕای سەبارەت بەبێ شەرمی ژنان دەربڕیبوو. چاوت دەکەوت بە هەواڵگەلی پەرشوبڵاوی تریش لە بەشە جیاجیاکانی ڕۆژنامەکە. لە کالیفورنیا ئەکتەرێکی ژنیان لە شوێنێکی بەرزەوە ناردبووە خوارێ و لە مابەینی ئاسمان و زەویدا هەڵپەسێراو مابووەوە. بڕیار بوو هەوا تەم و مژاوی بێت. بیرم لەوە کردەوە تەنانەت ئەگەر موسافیرێکی ڕێبواری ئەم گۆی زەویەش دەستی بدایەتە ئەم ڕۆژنامەیە، بە دڵنیایەوە هەر بەم بەڵگە پرش و بڵاوانەش لەوە دەگەیشت کە ئینگلیستان لە ژێر دەسەڵاتی سیستمێکی باوك سالارانەدایە. مەحاڵ بوو کەسێکی عاقڵ سەرنجی بۆ هێز و دەسەڵاتی پڕۆفیسۆر ڕانەکێشرێ. خاوەنی دەسەڵات و پووڵ و دەسڕۆیشتوویی بوو. ئەو خاوەن، سەرنووسەر و دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە بوو. وەزیری کار و باری دەرەوە و قازیش بوو. یاریزانی کریکێت بوو. خاوەنی گەلێ ئەسپی کێ بەرکێ و گەمی گەشتیاری بوو. بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك بوو کە لە سەتا دووسەتی قازانج دەدا بە بەشداربووەکانی. بە میلیۆنان پاوەندی بۆ ڕێکخراوە خێرخوازی و کۆلێژەکانی بن دەستی لە پاش بەجێ دەما. ئەکتەرە ژنەکەی لە نێوان عەرز و ئاسماندا بە هەڵپەسێراوی ڕادەگرت. بڕیاری دەدا کە تووکی سەر شەتیرەکە هی مرۆڤە یان نا، ئەوە، کە وا حوکمی پیاو کوشتن بەسەر پیاو کوژەکەدا دادەسەپێنێ یان پاکانەی بۆ دەکات، لە سێدارەی دەدات یان ڕزگاری دەکات. وادیار بوو جگە لە مژ گشت شتێك لە بن دەستی ئەودا بوو. کەچی بەو حاڵەشەوە قەڵس بوو. دەمزانی تووڕەیە، چون ئەو کاتەی نووسراوەکانیم سەبارەت بە ژنان دەخوێندەوە، نەك بیرم لەو شتەی وا دەیگوت بەڵکو لە خودی خۆی دەکردەوە. کاتێ کەسێك بە لەسەرە خۆیی باسی شتێك دەکات، هەر بیر لەو شتە دەکاتەوە و خوێنەریش ناتوانێ بیر لە

75-Sir Austen Chamberlain

شتێك جگە لەو شتە بكاتەوە. ئەگەر ئەو بە لەسەرە خۆیی سەبارەت بە ژنانی نووسیبایە، ئەگەر بەڵگەی حاشاهەڵنەگری بۆ بەڵگەداركردنی باسەكەی خۆی هێنابایە و مەیلی لە بە ئاكام گەیشتنێكی تایبەت نەبووایە، خۆینەریش تووڕە نەدەبوو. ڕاستەقینەی قەبوڵ دەكرد. هەر وەك چۆن قەبوڵی دەكات نۆكە فەریكە سەوزە و قەناری زەرد. بەو جۆرە، منیش دەمگوت قەیدێناكا. بەڵام من قەڵس بووم لە بەر وەی ئەو قەڵس بوو. بەم حاڵەشەوە بەدەم هەڵدانەوەی ڕۆژنامەی دوانیوەڕۆوە، بیرم لەوە كردەوە مەنتقی نییە پیاوێك بەو گشتە دەسەڵاتەوە قەڵس بێت. لە خۆمم پرسی نەكا قەڵسی بە چەشنێك ئاوەڵدوانەی دەسەڵات بێ؟ بۆ وێنە مرۆڤە دەوڵەمەندەكان زۆر جاران تووڕەن لەبەر ئەوەی پێیان وایە مرۆڤە هەژارەكان دەیانهەوێت ماڵ و سامانەكەیان داگیر كەن. لەوانەیە پرۆفیسۆرەكان، یان باوك سالارەكان-كە ڕەنگە ئەمە ناوێكی گونجاوتر بێ بۆ ئەوان —تا ڕادەیەك لەبەر ئەوە تووڕە بن، بەڵام هۆیەكی تریشی هەیە كە تا ئەو ڕادەیە ڕوون نییە. لەوانەیە هەر «تووڕەش» نەبن لە ڕاستیدا، ئەوانە زۆر جاران لە پێوەندیەكانی خۆیان لە ژینی تاكە كەسیدا كەسانێكی شایانی پێداهەڵگوتن و لێبوردە و لەبەرچاون. لەوانەیە ئەو كاتەی پرۆفیسۆر لە ڕادەبەدەر و بە پێداگریەوە جەختی لە سەر سووكایەتی ژنان دەكردەوە، بیری نەك لە سووكایەتی ژنان بەڵكو لە گەورەیی خۆی كردبێتەوە. ئەمە ئەو شتە بووە وا بە تووڕەیی و پێداگریەكی زۆرەوە بەرگری لێ دەكرد چون بۆ ئەو گەوهەرێك بوو بە بایەخێكی زۆر جیاوازەوە. ژیان بۆ هەر دوو ڕەگەزەكە-لەم كاتەدا، چاوم لە هەر دووكیان دەكرد وا شان بە شانی یەكتری لە پیادەرەوەكە دەڕۆیشتن-تاقەت پڕوكێن و دژوارە. خەباتێكی بێ وچان ونەبڕاوەیە. پێویستی بە غیرەت و هێزێكی گەورەیە. لەوانەیە بۆ ئێمەی دیلی گومان و خەیاڵ پتر لە هەر شتێكی تر پێویستی بە بڕوا بەخۆ بوون هەبێ. بێ بڕوا هەبوون بە خۆ وەك منداڵی شیرەخۆرە واین. بەڵام چۆن دەتوانین ئەو چۆنییەتیە نادیارە، كە لە هەمان كاتیشدا زۆر گرینگە، بە خێراترین شێوە ساز بكەین؟ بەم فیكرەوە كە مرۆڤەكانیتر لە ئێمە كەمترن. بەو هەستەوە كە لە چاو خەڵكانیتر لە خۆماندا جۆرە مەزنایەتیەكمان هەیە. -كە دەكرێ ماڵ و سامان، پلە و پایە، لوتێكی باریك، یان ئەو تابلۆی شێوەكاریەی ڕوخساری باپیرانمان بەرهەمی ڕامنی بێت"[٧٦]" لەبەر وەی فێڵ و تەڵەكە دڵتەزێنەكانی خەیاڵی مرۆڤ كۆتاییان نایات. بەم جۆرە، بۆ باوك سالار كە دەبێ دەست بە سەر وڵاتاندا بگرێت، دەبێ حوكمرانی بكات، ئەم هەستە زۆر گرینگە كە خەلكانێكی بێ ژومار، لە ڕاستیدا نیوەی

---

76-Romney

مرۆڤایەتی، لە خۆیدا لەو چرووکترن. لە ڕاستیدا، ئەم شتە دەبێ یەکێ لە گرینگترین سەرچاوەکانی دەسەلاتی ئەو بێ. بەلام ڕێم پێ بدەن تیشکی ئەم تێروانینە بهاوێژمە سەر ژیانی راستەقینە. ئایاکو ئەم پرسە بۆ هەندێ لەو مەتەڵە دەروونناسیانە وا لە پەنا و پەسیوی ژیانی ڕۆژانەدا تووشیان دێین هیچ ولام و شیکردنەوەیەکی هەیە؟ ئایا دەتوانێ سەرسووڕمانەکەی چەند ڕۆژ لەمەوبەری من شی بکاتەوە-ئەو کاتەی وا"[٧٧]"، پیاوێکی زۆر هێژا و خاکەڕا، کتێبێکی ڕێبکاوێست"[٧٨]"ی بە دەستەوە گرت، بەشێکی خوێندەوە و بە سەرسووڕمانەوە هاواری کرد: «فێمێنیستی بێ شەرم! دەڵێ پیاوان خۆ بە زل زانن! ئەم هاوارە، کە بۆ من زۆر زۆر سەیر بوو —بۆ چی دەبێ خاتوو وێست لە بەر ئەوەی راستەقینەیەکی دروست، بەلام ناخۆش سەبارەت بە ڕەگەزی بەرامبەرەکەی دەڵێ فێمێنیستێکی بێ شەرم بێت؟ -هاواری پۆز و غوروڕێکی بریندار نەبوو، هاواری دەنگهەڵبڕینێك بوو لە هەمبەر ئەو دەستدرێژییەی وا کرابووە سەر هەرێمی بڕوا بەخۆبوونەکەی. بە درێژایی گشت ئەم سەدانە، ژنان وەك ئاوێنەیەکی سێحراوی جولاونەتەوە کە هێزێکی جادوویی و خۆشیان هەیە و دەتوانن بەژنی پیاو دوو هێندەی خۆی بنوێنن. بێ ئەم هێزە، لەوانە بوو هێشتاکە سەر زەوی هەر زلکاو و دارستان بێت. بە شانازیەکانی شەڕەکانمان نەدەزانی. دەبوو هێشتاکە وێنەی ئاسك لەسەر ئێسکی مەڕ هەڵکۆڵین و بەردی چەخماخە بە پێستی مەڕ یان هەر شتێکی ڕازاوەی تر وا لەگەڵ زەوقە سەرەتاییەکەمان دەگونجا بگۆڕینەوە.قەت کەڵە پیاوان و فینگێرس ئاو دێستینی"[٧٩] "نەدەبوون. سێزار و قەیسەر قەت تاجیان لە سەر دانەدەنا، یان لە دەستیان نەدەچوو. ئاوێنە لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا هەر کەلکێکیشی هەبێ، دیسان پێویستە بۆ گشت کارە قارەمانانە و سەرەڕۆیەکان. لەبەر ئەوەشە وا ناپێلئۆن و موسیولێنی هەردووك بە پێداگریەوە جەختیان لە سەر سووکایەتی ژنان دەکرد، لەبەروەی ئەگەر ژنان چروك نەبوایەن، ئەوان نەیاندەتوانی گەورە بن. ئەم شتە تا ڕادەیەك پێویستی پیاوان بە ژنان شی دەکاتەوە. هەر وەها بێ سەبریی پیاوان لە هەمبەر ڕەخنەی ژنان ئەوەی کە مەحاڵە ژنێك پێیان بڵێ ئەم کتێبە خراپە، ئەم وێنەیەی کێشراوەتەوە لاوازی تێدایە، یان هەر شتێکی تر، و لە چاو ئەوەی پیاوێك وا هەر هەمان ڕەخنە دەگرێ دڵ هێشانێکی پتری بەدواوە نەبێت و ڕقێکی زیاتر هەڵنەستێنێت. لەبەر ئەوەی ئەگەر ژن بۆ گوتنی حەقیقەت زاری هەڵپچڕێ، ئیتر بەژنی ناو ئاوێنەکە بچووکتر دەبێتەوە لێهاتوویەکەی بۆ ژیان تێدا

77-Z
78-Rebecca West
79-Fingers of Destiny

دەچێت. ئەگەر کاتی سوبحانە و نەهار خۆی دوو هێندەی ڕادەی ڕاستەقینەکەی نەبینێ، چۆن دەتوانێ درێژە بدا بە دادوەریکردن، شارستانیکردنی ناوچەییەکان، تۆمارکردنی یاسا، نووسینی کتێب، جل لە بەر کردن و گوتەبێژی؟ بە کورتی بەدەم وردکردنی نان و لێکدانی قاوەکەم، و جار و بار چاولێکردنم لە خەڵکی سەر شەقامەکە نوقمی ئەم خەیاڵانە ببووم. وێنەی ناو ئاوێنەکە بایەخێکی زۆری هەیە، چون هێزی ژیان وەگەڕ دەخات، و دنەی سیستەمی عەسەبی دەدات. لە پیاوی بستێنی لەوانەیە بمرێ، وەك موعتادێکی خووگرتووی قۆڕبەسەر کە لە کوکائینیان بێبەش کردبێ. هەر وا کە چاوم لە پەنجەرەکە دەکرد، بیرم لەوە کردەوە کە نیوەی ئەو خەڵکەی لە پیادە ڕەوەکەوە تێدەپەڕن بە سیحری ئەو خەیاڵ و گومانەوە دەچنە سەر کار. لە بەر تیشکە خۆشەکەیدا هەموو ڕۆژێك کڵاو دەکەنە سەر و چاکەتەکەیان لەبەر دەکەن. ڕۆژەکەیان بە دڵنیاییەوە دەست پێدەکەن، بە بڕوا بە خۆ هەبوونەوە، بەو بڕوایەوە کە لە ئێوارە خوانەکەی خاتوو(( ئیسمیت ))دا جێگەیەکیان بۆ داندراوە. هەر کە هەنگاو دەخەنە ناو ژوورەکە، لەبەر خۆیانەوە دەڵێن من لێرا لە نیوەی خەڵکەکە لەسەرترم، ئاوەهایە کە بەو بڕوا بە خۆ بوونەوە قسان دەکەن، بە هەمان بڕوا بە خۆ بوونەوەی وا ئاوەها کاردانەوەیەکی گەورەی لە سەر ژیانی هەموو خەڵکی داناوە و شۆینی سەیری خستوەتە سەر پەڕاوێزی زەینی خەڵکی.

بەڵام هەودای فیکرەکانم سەبارەت بە بابەتی مەترسیدار و زۆر سەرنجڕاکێشی دەروون ناسی ڕەگەزەکەی تر کە هیوادارم ئێوەی وا ساڵی پێنسەد پاوەندو بۆ خۆو هەیە لێی بکۆڵنەوە-بە هۆی ئەوەی دەبوو ڕیزی حیسابەکەم بدەم لێ پچڕا. ڕیزی حیسابەکە پێنج شیلینگ و نۆ پێنس بوو. ئەسکەناسێکی دەشیلینگیم دا بە پێشخزمەتەکە و ئەو چوو باقیەکەی بهێنێتەوە. دراوێکی دەشیلینگی تر لە ناو جانتاکەمدا بوو بە وردی چاوم لێکرد، لەبەر وەی ئەمە ڕاستەقینەیەکە کە هێشتا سەرم لێی سووڕماوە توانایی کیفەکەم بۆ بەرهەم هێنانی خۆ بە خۆی دراوی دە شیلینگی. جانتاکەم کە دەکەمەوە، دراوەکان لە نێو جانتاکەمدان. کۆمەڵگە لە بەرامبەر، چەند کوتە قاقەزێکدا، کە لە پوورمەوە پێم گەیشتوە، مریشك، قاوە، قەرەوێڵەی خەو و شۆینی حاوانەوەم پێدەدا، هەر لەبەر وەی نێوەکەم لە نێوی ئەو دەچێ.

دەبێ بۆتان بگێڕمەوە کە پوورم، مێری بێتۆن، ئەوکاتەی لە بەمبەئی بۆ سەیران چووبوە ئەسپ سواری، لە ئەسپ کەوتە خوارێ. شەوێك هەواڵی میراتەکەییم پێ گەیشت، کە نزیك بوو لەو دەمەی وا یاسای مافی دەنگدان بە ژنان پەسەند کرا. نامەی پارێزەرێکیان خستبوە ناو سەندوقی پۆستیەکەوە و کاتێ هەڵمپچڕی، زانیم کە تا کۆتایی تەمەنم ساڵی پێنسەد پاوەندی بۆ بە جێ

هێشتووم. لەوە دچوو لەو دوانە-مافی دەنگدان و پارەکە-بە دڵنیاییەوە ئەو پارەیەی پێم بڕابوو زۆر گرینگتر بێ. تا ئەو کاتە ژینم بەکردنی ئیشی پرش و بڵاو بۆ ڕۆژنامەکان تێدەپەڕاند، گوزارشتێك سەبارەت بە شانۆیەکی پڕ و پووچ لە شوێنێك، یان شاییەك لە شوێنێکی تر چەند پاوەندێکیشم بە نووسینەوەی نیشانییەکانی سەر پاکەتەکان، کتێب خوێندنەوە بۆ خاتوونە بە ساڵاچووەکان، سازکردنی گوڵی دەسکردی، و فێرکردنی ئەلف و بێ بە زارۆکان لە باخچەیەکی ساوایان وەچنگ دەکەوت. ئەمانە زۆربەی ئەو کارانە بوو کە بەر لە ساڵی ١٩١٨ بۆ ژنان وەچنگ دەکەوت. پێموا نییە پێویست بێ ڕەنجەکانی ئەم کارانە بە تێر و تەسەلی باس بکەم، لەبەر وەی لەوانەیە ئێوە ژنانێك بناسن کە خەریکی ئەم کارانە بووبن هەر وەها پێموا نییە پێویستێك بێ کە کێشەی ژین کردن بەم پارەیەوە، کاتێ کە وە دەست دەکەوت، بۆتانی شی بکەمەوە. چونکە لەوانەیە ئێوەش ئەو ئەزموونەتان هەبێ. بەڵام ئەو شتەی کە هێشتاش وەك بەڵایەکی زۆر خراتر لەم دوانە لە مندا ماوەتەوە ژاری داماوی و ترسێکە وا ئەو سەردەمانە کردویانەتە گیانی منەوە. لە قۆناغی یەکەمدا،کردنی پەیتا پەیتای کارێك کە پێت خۆش نەبوو بیکەی، ئەویش وەك کۆیلەکان، بە ماستاوکەری و زمان لووسی، کە لەوانەیە هەمووکاتیش پێویست نەبووبێ بەڵام بە پێویست دەزانرا و پا ترازانیش نرخێکی زۆری هەبوو، پاشان بیر کردنەوە لەو مرخەی وا شاردنەوەکەی مردن بوو-لێهاتوویەکی بچوك بەڵام بۆ خاوەنەکەی بەڕێز-ئەو مرخەی وا لە ناو دەچوو و لەگەڵی خودی من و ڕۆحیشم لە ناو دەچووین-گشت ئەمانە لە ژەنگی گیایەك دەچوو وا شکۆفەی بەهاریان تێدا دەبرد، دارەکەیان لە بنجەوە لە ناو دەبرد. بەڵام، هەر وەکی گوتم، پوورم مرد هەر کاتێك دراوێکی دە شیلینگی ورد دەکەمەوە، کەمێك لەو زووخاو و مەینەتانەم دەڕەوێنەوە ترس و داماوی لا دەچن. بە دەم خستنەوەی پوڵە وردەکان بۆ ناو جانتاکەم، بیرەوەریە ناخۆشەکانی ئەو سەردەمانەم وەبیر هاتەوە و بیرم لەوە کردەوە، بە ڕاستی سەیرە داهاتێکی دیاریکراو چەندە حاڵ و ناخی مرۆڤ دەگۆڕێ. هیچ هێزێك لەم جیهانەدا ناتوانێ ئەو پێنسەد پاوەندەم لێ وەرگرێت. خواردن و ماڵ و جل و بەرگم بۆ هەتاهەتا دابین کراوە. کەواتە نەك هەر بە هەوڵ و تەقەللا، بەڵکە بە قین و داماویش کۆتایی دێت. پێویست ناکا قینم لە هیچ پیاوێك بێ ئەو ناتوانێ هیچ خەسارێکم لێدات. پێویست ناکا ماستاوچیەتی هیچ پیاوێك بکەم ئەو شتێکی نییە تا بمداتێ. تێگەیشتم وردە وردە خەریکە هەڵوێستێکی ترم دەبێ سەبارەت بە نیوەکەی تری مرۆڤایەتی. بە گشتی، سەر کۆنەکردنی چینێك یان ڕەگەزێك گاڵتەجاڕ بوو. بەشێکی زۆری خەڵکی قەت بەرپرسی ئەو کارانە نین کە دەیکەن. غەرایەزێك بەرەو پێشەوەیان دەبات کە لە بن دەستیاندا نییە. ئەوانیش، واتە باوك

سالارەکان و پرۆفیسۆرەکان، کیشەگەلێکی زۆریان هەبوو، کۆسپی زۆر گەورەیان لە سەر ڕێ بوو کە دەبوو لای بەن. خۆیندەواریەکانیان لە هەندێ لاوە بە قەرا خۆیندەواریەکانی من ناتەواو بوو. بە قەرا من ئەوانیشی کۆڵەوار کردبوو. ڕاستە ئەوان پارە و دەسەڵاتیان هەبوو، بەڵام هەر بۆ پەروەردەکردنی دالێك، دالاشێك، لە ناو هەناویاندا، کە بۆ هەتا هەتا جەرگی دەخواردن و چڕنووکی دەگرت لە دڵیان —غەریزە بۆ داگیرکردن، قین بۆ دەسکەوت، وای لێ دەکردن هەتا هەتا زەوی و شتەکانی خەڵکانی تریان بوێت سنوور و ئاڵا، کەشتی و گازی ژەهراوی ساز بکەن ژیانی خۆیان و منداڵەکانیانی لە پێناودا دانێن. بە بن تاقی دەریا سالاران"[٨٠]"دا تێپەڕن (ئێستەکە گەیشتبوومە ئەو بینای یادبوودە)، یان لە هەر شەقامێکەوە کە بە تۆپ و یادبوودەکانی شەڕ ڕازاوەتەوە، سەبارەت بەو شانازیەی وا لەو شۆینە ڕێزی لێدەگرن تێبفکرن. یان لە هەتاوی بەهاردا، چاو لە گزیر و دەڵاڵی سەهامەکان و پارێزەرێکی سەرکەوتوو بکەن کە دەچنە ناو بینایەك بۆ وەی پتر وپتر پوڵ پەیدا بکەن، لە کاتێدا بێ گومان ساڵی پێنسەد پاوەندیش سەرت هەر ڕادەگرێ. بیرم لەوە کردەوە ئەمانە غەرایەزێکی ناخۆشن کە مرۆڤ لە خۆیدا پەروەردەیان بکات. هەر وا کە چاوم لە پەیکەرەی دووکی کەمبریج دەکرد، بە تایبەت لە پەڕە خوارەکانی کڵاوەکەی کە سەرنج و ورد بوونەوەیەکی نایابیان ویستبوو، بیرم لەوە کردەوە ئەمانە بەرهەمی بارودۆخێکی ژیانن، بەرهەمی نەبوونی شارستانییەتە. ئەو کاتەی لەم کێشە و کۆسپانە گەیشتم، وردە وردە بەزیی و پێکەوە هەڵکردن هاتنە جێی ترس و داماوی وە پاشان بە یەك دوو ساڵان، بەزیی و پێکەوە هەڵکردن لە ناو چوون، ڕزگاریە مەزنەکە لەولاوە گەیشت، ئەویش ئازادیی بیرکردنەوە لە خودی پرسەکان بوون. بۆ وێنە ئەو بینام پێ خوشە یان نا؟ ئەو تابڵۆیە جوانە یان نا؟ ئەو کتێبە بە ڕای من کتێبێکی باشە یان خراپ؟ لە ڕاستیدا، میراتەکەی پوورم بۆ من پەردەی لە سەر تەختی ئاسمان لادا، و دیمەنێکی لە ئاسمانی کراوە و بەرین خستە جێی پەیکەری بە خۆوە و بە شکۆی ئەو پیاوەی وا میلتۆن بۆ پەرستنی هەتا هەتای منی لە بەر چاو گرتبوو.

نوقمی ئەم فیکر و ئەندێشانە ڕێگەی خۆمم بەرەو ماڵەکەم لە پەنا چۆمی دیتەوە. چراکان دادەگیرسان و لەندەن لە چاو بەیانی توشی گۆڕانکاریەکی وەسف نەکراو ببوو. دەتگوت ئەو ماشێنە دێو ئاسایە پاش ڕۆژێك ئیشکردن بە یارمەتی ئێمە چەند مەتر لە شتێکی زۆر جوان و هەژێنەر بەرهەم هێنابوو-کۆتاڵێکی ئاگرین بە چاوانێکی سووری تروسکە دارەوە، دێوێکی تاریك و

---

80-Admiralty Arch

تنۆك وا دەیگوڕاند و هەناسە کولاتووەکەی خۆی دەر دەدا. تەنانەت لەوە دەچوو کە با ماڵەکانی داوەتە بەر قەمچی و دیوارەکانی دەلەراندەوە.

بەلاّم لە شەقامە چکۆلەکەی مندا ژین لە گۆڕێدا بوو. بۆیەکەری ماڵەکە لە نێردیوانەکەی خۆی دەهاتە خوار پەرستاری منالەکە بە وریاییەوە کالیسکەکەی دەبردە ناو ماڵەوە، حەمالی ڕەژیەکە تەلیسەکانی خۆی بە جوانی قەد دەکرد و لە سەر یەکی دادەنان ئەو ژنەی خاوەنی دوکانی سەوزی فرۆشیەکە بوو داهاتی ئەو ڕۆژەی بە قامکەکانی ناو دەسکێشە سوورەکەی دەبژارد. بەلاّم من وا گیرۆدەی ئەو کێشەیە ببووم وا ئێوە منتان تێوەرداوە کە تەنانەت نەمدەتوانی ئەم دیمەنانە بەبێ گەڕانەوەیان بۆ پرسێکی سەرەکی ببینم. بیرم لەوە کردەوە ئەوڕۆکە لە چاو سەد ساڵ گوتنیشی، ئەوەی کام یەك لەم ئیشانە گرینگتر و باشترن چەندە دژوارە. باشترە حەمالی ڕەژی بی یان پەرستاری منداڵ؟ ئایا خزمەتکارێك کە هەشت منداڵی گەورە کردووە بێ بایەخترە لە پارێزەرێك کە سالی سەد هەزار پاوەندی داهات هەیە؟ ئەم چەشنە پرسیارانە بێ سوودن، لەبەر وەی کەس ناتوانێ وەلاّمیان بداتەوە. نەك بایەخی ڕێژەیی خزمەتکار و پارێزەر لە سەر دەمانێکەوە بۆ سەردەمانێك دەگۆڕدرێت، بەلکە تەنانەت ئێمە ئێستاکەش پێوەرێکمان بۆ دیاریکردنی بایەخ بە دەستەوە نییە. داواکەی من لە پرۆفیسۆر، بۆ بە دەستەوەدانی« بەلگەی حاشا هەلنەگر لەم جۆر یان ئەو جۆرە، داوایەکی گەمژانە بوو. تەنانەت ئەگەر بشکرێ بایەخی هەر مرخ و برشتێك لەو ساتەدا دیاری بکەی، سەد سالی تر ئەو بایەخانە دەگۆڕدرێن ئەو بایەخانە تا ڕادەیەکی زۆر بە گشتی گۆڕدراون. کە گەیشتمە بەر پلیکانی ماڵەکەم، بیرم لەوە کردەوە، جگە لەمە سەد سالی تر ئیدی ژنان ڕەگەزێك نابن چاوەدێریان لێ بکرێت. بە پێی مەنتق لە گشت ئەو کار و بزاڤانەی وا سەر دەمانێك لێی بێبەش کرابوون بەشداری دەکەن. پەرستاری منالْ سەردەمانێك ڕەژی دەکێشێت. ژنەی دوکاندار شەمەندەفەر لێ دەخورێت. گشت ئەو گریمانانەی وا لە ڕووی ڕاستەقینەکانی سەردەمانێکەوە داندراون وا ژنان ڕەگەزێك بوون لە ژێر چاوەدێریدا، لە ناو دەچن-بۆ وێنە (لەم کاتەدا جووقەیەك سەرباز بە شەقامەکەدا تێپەڕین)ئەوەی کە ژنان و باخەوانان و قەشەکان لە خەلکانی تر تەمەن درێژترن. ئەو چاوەدێریە لا بەن، هەلی هەمان بزاڤ و هەمان ئەو ئیشانە بۆ ژنان برەخسێنن، ئەوان بکەنە سەرباز و مەلەوان و لێخوڕی شەمەندەفەر و کرێکاری بەندەر، ئەو کات ئایا ژنان زۆر زووتر و گەنج تر لە پیاوان نامرن، تا وای لێ بێ بە جۆرێك بلێین «ئەوڕۆکە ژنێکم دیت» کە سەر دەمانێك دەمانگوت« فرۆکەیەکم دیت ». ئەو کاتەی دەرکەکەم کردەوە بیرم کردەوە سەردەمانێك کە ئیتر ژن بوون ئیشێکی لە ژێر چاوەدێریدا نەبێت، لەوانەیە

هەموو شتێك ڕوو بدات. كە دەچوومە ژووریَ لە خۆمم پرسی، بەڵام گشت ئەمانە چ پێوەندیەکی بە بابەتی گوتارەکەی منەوە، ژن و چیرۆك، هەیە؟

# بەشی سێهەم

جێگەی داخ بوو کە نەمتوانیبوو ئێوارەی ئەو ڕۆژە ڕایەکی گرنگ یان زانیاریەکی نۆی بێنمەوە. ژنان لە پیاوان هەژارترن بەم هۆ یان ئەو هۆ. ڕەنگە وا باشترە ئیتر بە دووی حەقیقەتدا نەگەڕێم و لە جیاتی ئەو خۆم بخەمە ناو دەریایەك لەو بیر و ڕایانەی دەربڕاون، بیر و ڕاگەلێکی گەرم و بەتین وەك قالّکراوەکانی دەوری ئاگرپژێن و بێڕەنگ وەك تەڕەتووڕکاو. ڕەنگە وا باشترە پەردەکان دادەمەوە، ئەو شتانەی هۆشم دەبەن لە خۆمیان دوور خەمەوە، چراکان داگیرسێنم، پرسیارەکەم سنوودار کەم و لە مێژونووس، وا حەقیقەتەکان تۆمار دەکات نەك ڕادەربرینەکان، بپرسم کە ژنان نەك لە گشت شۆینێك و لە گشت سەدەکاندا، بەڵکو بۆ وێنە لە بەریتانیای سەردەمی ئیلیزابێتدا چۆن ژیاون.

لەبەر وەی ئەمە مەتەڵێکی هەتا هەتاییە کە بۆ چی هیچ ژنێك وشەیەکی لەو ئەدەبیاتە سەیر و سەمەرەیە نەنووسیوە لە کاتێکدا وادیارە زۆربەی پیاوان دەیانتوانی شێعرێك و غەزلێك بهۆننەوە. لە خۆمم پرسی ژنان لە چ باروو دۆخێکدا ژیاون لە بەر وەی چیرۆك، و هەر کارێکی داهێنەرانە و زەینی تر لە بنەڕەتدا، خۆ وەك بەرد لە ئاسمانەوە نابارن-هەر چەندە لەوانەیە ئەم شتە سەبارەت بە زانست ڕەوا بێت. چیرۆك وەك داوی جالّجالّووکە وایە، کە ڕەنگە پێکەوەلکانێکی زۆر ناسك و نادیاری هەبێت، کەچی هەر، بە چوار لای ژیانەوە لکاوە. ئەم پێوە لکانە زۆر جاران نابینرێ بۆ وێنە شانۆ نامەکانی شێکسپیر دەڵێی هەر خۆ بە خۆ تەواون و بەبێ ئەوەی بە هیچ شتێکەوە لکابن بە حەواوە هەڵواسراون. بەڵام ئەو کاتەی جالّی جالّجالّووکە خوار و خێچ دەبێت، بە سووچێکەوە دەنووسێت، یان لە ناوەڕاستەوە لەت دەبێت، لە بیرمان دێتەوە ئەم داوانە بوونەوەرێکی غەیری مادی بە حەواوە نەیتەنیونەتەوە، بەڵکو بەرهەمی کاری مرۆڤە نەحەساوەکانە و بە هۆگەلێکی زۆر مادیەوە بەندن، بۆ وێنە بە لەش ساغی و پولّ و ئەو ماڵەی تێیدا دەژین.

کەواتە بەرەو پەرتووکە مێژوویەکان چووم و دەستم دایە دانەیەك لە نوێترینەکانیان، مێژووی ئینگلیستان بە قەڵەمی پرۆفیسۆر ترێوێلیان"[٨١]". جارێکی تر چوومەوە سەر مەدخەلی «ژنان» و «بارودۆخی» ژنانم دییەوە و لاپەڕە ئاماژە پێکراوەکانم هەڵداوە و خۆیندمەوە: «لێدانی ژن ماڤی ڕەوای پیاوان بوو و بێ شەرمەساری لە نێوان چینەکانی سەرەوە و خوارەوەی کۆمەڵگادا باو بوو....مێژوونووس پاشان ئاوا درێژەی پێدەدات: «هەر وەها ئەگەر کچێك ملی نەدایە بە شووکردن بەو پیاوەی دایك و بابی بۆیان هەڵدەبژارد، لە بەند دەکرا، لێی دەدرا، لە بن مست و پێلاقەدا پان دەبوەوە بێ ئەوەی هیچ جموجۆڵێك بکەوێتە ناو بیر و ڕای گشتیەوە. زەماوەندکردن، بە تایبەت لە نێو چینەکانی سەرەوە و بە ناو نەجیبزادەکاندا، پێوەندییەك بوو نەك لە سەر بنەمای ئێحساسات و عەواتیفی تاکە کەسی، بەڵکو لە سەر بناغەی تەماح و هەڵپە هەڵپی بنەماڵە دادەمەزرا. زۆر جاران کاتێ کە یەکێکیان یان هەردووکیان لە لانکەدا بوون نیشانە دەکران، ئەو کاتەی زەماوەندیان ئەکرد تازە لە بن دەستی لەلە و پەرستارەکەیان هاتبوونە دەرێ. ئەمە لە دەورووبەری ساڵی ١٤٧٠ دا بووە، کەمێك پاش سەردەمانی چاسێر"[٨٢]". چوونە لاکەی دواترم بۆ سەر بارووددۆخی ژنان دەورووبەری دووسەت ساڵ دواتر، لە سەردەمی ئیستوارتەکاندایە. «هیشتاش ژنانی چینەکانی سەروو و ناوەندی زۆر کەم هاوسەرەکەی خۆیان هەڵدەبژارد و ئەو مێردەی کە بۆیان دیاری دەکرا دەوڵەمەند و نەجیبزادە و ئاغاوات بوو، لانیکەم ئەوندەی یاسا و عورف و باوی کۆمەڵگا دەیویست. بەڵام پرۆفیسۆر ترێوێلیان بەو ئاکامە دەگات: «لە چاو ئەمانەش، نە لە بەرهەمەکانی شێکسپیردا، و نە لە کتێبگەلی بیرەوەریە باوەڕپێکراوەکانی سەدەی حەڤدەیەمدا، وەك بیرەوەریەکانی وێرنی"[٨٣]"و هاچینسۆن"[٨٤]"، لەوە ناچێ ژنان لە باری کەسایەتی و توانایییەوە شتێکیان کەمی هەبێت. کاتێ باش بیر دەکەینەوە بەم ئاکامە دەگەین کە بێ گومان کلیۆپاترا مۆرەی ماری هەبووە لەوانەیە لیدی مەکبێت لە لایەن خۆیەوە ئیرادەی بووبێ و ڕەنگە رۆزالید کچێکی دلڕفێن بووبێ. کاتێ پرۆفیسۆر ترێوێلیان دەڵێ ژنانی شێکسپیر لە باری کەسایەتیەوە هیچیان کەم نییە، جگە لە حەقیقەت هیچ ناڵێ. لەوێڕا کە مێژوونووس نین، دەتوانین لەمەش واوەتر بچین و بڵێین کە ژنان لە سەرەتای خیلقەتەوە وەك چرایەك لە ناو بەرهەمەکانی گشت شاعیرەکاندا درەوشاونەتەوە. لە نێو شانۆنامەنووسەکاندا، کلایتێمێنسترا، ئانتیگونێ، کلیۆپاترا،

81-Sir George Otto Trevelyan ,History Of England
82-Geoffrey Chaucer
83-Verney
84-John Hutchinson

خاتوو مەکبێت، فێدێر، کرێسیدا، ڕۆزالیند، دێزدێمونا، خاتوو مالفی لە ناو نووسەرەکاندا، میلمانت، کلاریسا، بێکی شارپ، ئاناکارنینا، ئێما بواری، و مادام دوگورمانت. ناوەکان هێرش دەکەنە سەر زەین، و هیچکامیان ژنێکمان ناخاتەوە یاد کە لە باری توانایی و کەسایەتیەوە هیچیان کەمی نەبێ. لە ڕاستیدا، ئەگەر ژنان تاقە لە ناو چیرۆکی پیاواندا بوون، ئەو وێنەیەی لێیان دەکەوتە سەر زەین شتێك بوو زۆر گرینگ، زۆر ڕەنگاوڕەنگ، قارەمانانە و بێ نرخ، ئازا و بێ دەسەلات، لەڕادەبەدەر جوان و زۆر زۆر ناحەز، مەزن وەك پیاوان، و تەنانەت بە ڕای هێندێکیش مەزنتر"[٨٥]. بەلام ئەمە ژنێکی ناو چیرۆکە. ژنی ڕاستەقینە، هەر وەك پرۆفیسۆر ترێو یلیان ئاماژەی پێدەکات، لە بەند دەکرا، لێی دەدرا و لە بن مست و پێلاقەدا پان دەکراوە.

بەم جۆرە، بوونەوەرێکی زۆر سەیر و تێکەڵ پێکەڵ وەدیار دەکەوێت. بوونەوەرێك وا لە باری خەیاڵی و زەینییەوە بایەخێکی زۆری هەیە، کەچی لە ڕاستیدا تەواو بێ بایەخە. بوونەوەرێك وا لە گشت کتێبە شێعریەکاندا دەورێکی گەورەی هەیە، بەلام لە مێژوودا تەواو نادیارە. دەسەلاتداری ژینی پاشایان و دەسەلاتدارانی چیرۆکە، کەچی لە ڕاستیدا دەبووە کۆیلەی کوڕێك وا دایك و بابی بۆیان نیشانە دەکرد. هەندێك لە جوانترین وشەکان، هەندێك لە قووڵترین فیکرەکان لە ئەدەبیاتدا لە

٨٥- «ئەمە ڕاستەقینەیەکی سەیرە و تا ڕادەیەکیش پاساوی نیە کە لە شاری ئاتێن، وا ژنان لەوێ وەك قەرەواش یان حەماڵ و بە قەرا ژنانی شەرقی دەچەوسانەوە، لە دیمەنی شانۆدا کەسایەتیگەلێکی وەك کلایتێمنێسترا و کاساندرا و ئانتیگونێ و فێدێر و مێدێئا، و قارەمانانێکی ژنی تر بێنە ئاراوە کە شانۆکانی ئوریپید، شانۆنامەنووسی دژە ژن، بخەنە ژێرکاریگەری خۆیانەوە. بەڵام قەت هۆیەکی جێی باوەڕ بۆ مەتەڵی دونیایی بە دەستەوە نەدراوە کە تیایدا ژنێکی ماقوڵ بە زەحمەت دەیتوانی لە ژیانی ڕاستەقینەدا بە تەنێ بێتە سەر شەقام، کەچی لە چاو ئەمەش ژنان لە دیمەنی شانۆدا یان هاوتای پیاوانن یان لەوان وەپێش دەکەون. تراژێدیای مۆدێرنیش ئەم زاڵ بوون و لەپێش بوونەی تێدایە. چاوخشاندنێکی خێرا بە بەرهەمەکانی شێکسپیردا (و هەروەها وێبێستێر، بەڵام نەك مارلۆ یان جانسۆن) پێمان دەڵێ کە ئەم لە پێشبوونە، ئەم کار کردنەی ژنان بەو شێوە تایبەتە، لە ڕۆزالیندەوە تا لیدی مەکبێت درێژەی پێدەدرێ. شەشدانە لە تراژێدیەکانی ڕاسینیش نێوی قارەمانە ژنەکانیان بەسەرەوەیە دەتوانین کامە لە کەسایەتیە پیاوەکانی ئەو لە بەرامبەر هێرمیون و ئاندرۆماك، بێرنیچە و ڕۆکسان، فێدێر و ئاتالی دابنێین؟هەر وەها لە بەرهەمەکانی ئیبیسێندا کامە پیاو لە گەڵ سولویژ و نورا، هێدا و هیلدا وێنگێل و ڕێبکا وێست یەکسانە؟» ( F. L. Lucas,Tragedy,PP. 114-115)

زاری ئەو دێتە دەر بەڵام لە ژینی ڕاستەقینەدا بە زەحمەت دەیتوانی بخوێنێتەوە، زۆر کەم دەیتوانی بنووسێت، و سەتا سەت ملکی مێردەکەی خۆی بوو.

بێ گومان، سەرەتا بە خوێندنەوەی بەرهەمی مێژوونووسان، وە پاشان شاعیران، دێوێکی سەیر لە زەینی مرۆڤدا بیچم دەگرێت، کرمێك بە باڵی داڵەوە، ڕۆحی ژیان و جوانی لە چێشتخانە لە کاتی وردکردنی دووگدا. بەڵام ئەم دێوە هەر چەندەش بۆ هێزی خەیاڵ سەرنجڕاکێش بێ، لە ڕاستیدا بوونێکی دەرەکی نییە. بۆ وەی ژینی پێ ببەخشی دەبێ لە یەك کاتدا شاعیرانەش و ویشکیش بیر بکەیتەوە بەم جۆرە، لە لایەکەوە لەگەڵ حەقیقەتەکان ڕوبەڕوو دەبینەوە —ئەوەی کە ئەو خاتوو مارتینە، سی و شەش ساڵە، بە جلێکی ئاویەوە، کڵاوی ڕەش و پێڵاوی قاوەیی. بەڵام، لە لایەکەی ترەوە، نابێ چیرۆکمان لە بیر بچێتەوە-ئەوەی کە ئەو دەفرێکە وا هێز و هەیەجانگەلێکی جۆراوجۆر بۆ هەتا تیایدا لەگەڕدان و دەدرەوشێنەوە. بەڵام هەر کە ئەم شێوەیە بۆ ژنانی سەردەمی ئیلیزابێت بە کار بێنین، لقێکی مەعریفە دەکوژێتەوە کەمایەتی ڕاستەقینەکان ڕێگەمان پێدەگرن. هیچکام لە وردەکاریەکان، هیچ حەقیقەتێکی سەلمێندراو و ڕەوای لە بارەوە نازانین. مێژوو زۆر کەمی ئاماژە پێدەکات. و من جارێکیتر چوومەوە لای پرۆفیسۆر ترێویلیان تاوەکوو بزانم مێژوو چ واتایەکی پێدەدا. بە چاو خشاندنێك بە سەردێڕی بەشەکانی کتێبەکەیدا تێگەیشتم کە لە ڕوانگەی ئەوەوە مێژوو بەم واتایە بوو:

«سیستەمی ئاغاوات و شێوەکانی کشت و کاڵ، چلە کێشانی سیستەرسیان"[٨٦]" و ئاژەڵداری، شەڕە خاچیەکان، زانکۆ، مەجلیسی عەوام، شەڕە سەت ساڵەیەکان، شەڕەکانی ڕۆز، ڕێنسانس، لە ناو چوونی پەرستگاکان، دەمەتەقێکان لە مەڕ زەوی و ئایین، سەرچاوەی دەسەڵاتی دەریایی بەریتانیا، شەڕی ئارمادا...و هتد. جارجارێك ئاماژە بە ژنێکی تایبەت دەکرێ، ئێلیزابێت یان مێری، شاژنێك یان خاتوونێکی مەزن. بەڵام ژنی چینی ناوەندی بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی تاقە بە پاڵپشتی بیر و کەسایەتیەکەی خۆی لە هیچ کام لەو بزووتنەوە گەورانەدا بەشداری بکات ئەو بزووتنەوە گەورانەی وا بە یەکەوە ڕای مێژوونووسان سەبارەت بە ڕابردوو پێك دێنن. ناتوانی لە هیچ کام یەك لە کۆمەڵە چیرۆکەکانیشدا ببینییەوە. ئابری"[٨٧]"زۆر کەم ئاماژەی پێدەکات. قەت ژیاننامەی خۆی نانووسێ و زۆر کەم دەفتەرچەی بیرەوەری هەیە تاقە هەندێکی زۆر کەم لە نامەکانی لەبەر دەستدا هەیە. شانۆنامە و شێعرێکی لە دووی خۆی بەجێ نەهێشتووە تا لە

86-Cistercian
87-Aubrey

ڕوویانەوە بڕیارێکی لە سەر بدەین. بیرم لەوە کردەوە ئەو شتەی پێویستە-بەڕاستی بۆ چی خوێندکارێکی زیرەك لە نیوهام یان گێرتەن کۆی ناکاتەوە؟ -کۆلێك زانیاریە لە چ تەمەنێکدا زەماوەندی کردووە وەکی باو چەند منداڵی هەبووە ماڵەکەی چۆن بووە ئایا ژوورێکی بۆ خۆی هەبووە ئایا بۆ خۆی چێشتی لێ دەنا ئایا لەوانەیە خزمەتکارێکی هەبووبێ؟ گشت ئەم خەبەر و باسانە لەوانەیە لە شۆێنێکدا، لە دەفتەرەکانی تۆمارکردنی ناو و ئەرشیف و ژمێریاریەکاندا، هەبێ. ژیانی ژنی ئاسایی سەردەمی ئێلیزابێت بێ گومان لە شۆێنێکدا بە پرش و بڵاوی تۆمار کراوە، و دەکرێ کۆ بکرێتەوە و ببێتە کتێب. بە دەم گەڕانم بە دووی کتێبە نەنووسراوەکانی نێوان قەفەسەکان، بیرم کردەوە زۆری ئازایەتی دەوێت کە پێشنیار بدەم بە خوێندکارانی زانکۆ بە ناو بانگەکان وا دیسان مێژوو بنووسنەوە، هەرچەندە لە سەر ئەو بڕوایەم مێژوو، بەم جۆرەی هەیە، کەمێك سەیر و بە دوور لە ڕاستەقینە و یەك لایەنە دەکەوێتە بەرچاو. بەڵام بۆچی نابێ پاشکۆیەك لە سەر مێژوو بنووسن؟ و هەڵبەت نێوێکی لە سەر دانێن تا سەرنجان ڕانەکێشێ و ژنان بتوانن بەبێ هەڵە و چەوت تیایدا دەرکەون. لەبەر وەی زۆر جاران سێبەرێکیان بە سەر گەورەکانەوە دەبینین و خێرا لە پانتاییەکەدا دەڕەوێنەوە. و پێموایە جار جارە چاوداگرتنێك، پێکەنینێك، و ڕەنگە فرمێسکێکیش بشارێتەوە. هەر چۆنێك بێ ئێمە بە ڕادەی پێویست(( جین ئاستەن))مان هەیە وادیارە هێند پێویست نییە جارێکی تر بە سەر کاریگەری تراژێدیەکانی جوانا بێیلی لە سەر شێعرەکانی (( ئێدگار ئالێن )) پۆ دا بچینەوە"[88]"و هێندەی پێوەندی بە منەوە هەیە، قەیدێ ناکا کە دەرکەی ماڵی مێری ڕاسێل میتفۆرد"[89]"لانی کەم تا سەدەیەك لە سەر خەڵکی داخرابێ. هەر وا کە دیسان چاوم دەگێڕا بە نێو قەفەسە کتێبەکاندا، لە بەر خۆمەوە گوتم، بەڵام ئەو شتەی بە لای منەوە خەفەت هێنە ئەوەیە کە تا سەدەی هەژدە شتێك سەبارەت بە ژنان نازانین. هیچ وێنەیەکم لە زەیندا نییە تا بەم لا یان بەو لادا بڕۆم. دەپرسم بۆ چی ژنان لە سەردەمی ئێلیزابێتدا شێعریان نەدەنووسی، لە کاتێکدا نازانم چەندیان خوێندەواری هەبووە، ئایا نووسینیان دەزانی؟ ئایا ژوورێکی

---

٨٨- Joanna Baillie (١٨٥١-١٧٦٢) شانۆنامە نووس و شاعیر، هاڤاڵی سێر والتێر ئیسکات بوو کە ناوی «جوانای نامیرا»ی لە سەر دانا. ڕوون نیە بۆ چی وۆلف لە جیاتی کاریگەری جوانا بێیلی لە سەر ئیسکات باسی کاریگەری جوانا بێیلی بە سەر ئیدگار ئالێن پۆ وە دەکات. لەوانەیە لە ڕاستیدا مەبەستی تەنزە و مەبەستی ئەوەیە کە جیاوازیەك لە نێوان ئیسکات و ئالێن پۆ دا نابینێت. -وف

٨٩- Mary Russell Mitford (١٨٥٥-١٧٨٧)، نووسەری بەرهەمگەلی چیرۆکی جۆراوجۆر، وەك گوندی مە("Our Village"[١٨٣٢])کە کۆمەڵە چیرۆکێکی زۆر باش بوو. -وف

دانیشتنی تایبەت بە خۆیان هەبوو؟ چەندە لە ژنان بەر لە بیست و یەك ساڵی منداڵیان دەبوو؟ بە کورتی لە هەشتی بەیانییەوە تا هەشتی ئێوارە چییان دەکرد. بەو جۆرەی دیارە، پولێکیان نەبوو بە قسەی پرۆفیسۆر ترێویلیان، چ پێیان خۆش بووایە و چ پێیان ناخۆش بووایە، بەر لە کۆتایی هاتن بە قۆناغی منداڵیان، و ڕەنگە لە پازدە شازدە ساڵیدا شوویان دەکرد. بە پێی ئەم زانیاریە کەمانە، بەو ئاکامە گەیشتم کە زۆر سەیر دەبوو ئەگەر یەکیان لە پڕ شانۆنامەکانی شێکسپیریان بنووسیایە، وەبیر ئەو ئاغا پیرە کەوتمەوە کە ئێستاکە نەماوە، بەڵام پێموایە ئۆسقۆف بوو و دەیگوت، مەحاڵە ژنێك لە ڕابردوودا، لە ئێستا یان داهاتوودا مرخ و بڕشتی شێکسپیری هەبێت. ئەو لەم بوارەدا شتی بۆ ڕۆژنامەکان دەنووسی. هەروەها ئەم جەنابی ئۆسقۆفە بە خاتوونێك کە بۆ وەدەسهێنانی زانیاری چووبووە لای گوتبووی کە لە ڕاستیدا پشیلەکان ناچنە بەهەشت، هەر چەندە شتێکی وەك ڕۆحیان لە بەردایە. ئەم ئاغا بە ساڵاچوانە چەندە چەرمەسەری تێفکرینیان لە کۆڵ مرۆڤ کردوەتەوە! تێگەیشتنی زۆری ئەم ئاغایانە چەندە کۆسپی دەخستە سەر ڕێی تێنەگەیشتوویی و نەزانی! پشیلەکان ناچنە بەهەشت. ژنان ناتوانن شانۆنامەکانی شێکسپیر بنووسن.

بەم حاڵەشەوە، هەر وا کە سەیری بەرهەمەکانی شێکسپیرم لە ناو قەفەسەکەدا دەکرد، نەمدەتوانی بیر لەو شتە نەکەمەوە وا لانی کەم بەشێکی قسەکانی ئۆسقۆف ڕاست بووە، قەت ژنێك بۆی نەدەلوا بتوانێ شانۆنامەکانی شێکسپیر لە سەردەمی شێکسپیردا بنووسێ. لەوەیڕا کە دەست پێڕاگەیشتن بە زانیاریەکان زۆر ئەستەمە، ئیزنم بدەنێ ئەوە بهێنمە بەر چاوم کەچی ڕووی دەدا ئەگەر شێکسپیر خوشکێکی زۆر بە توانای بۆ وێنە بە نێوی جودیتی هەبوایە. بە شیمانەیەکی زۆر بەهێز، خودی شێکسپیر چووەتە قوتابخانە-دایکی لە بنەماڵەیەکی دەسڕۆیشتوو بووە و لەوانەیە لەوێ زمانی لاتین فێر بووە و بەرهەمەکانی ئۆڤید و ڤیرژیل و هۆراسی خوێندووەتەوە و پێشەکیەکانی ڕێزمان و مەنتق فێر بووە. هەموان دەزانن منداڵێکی شەڕانی بووە و بە دزییەوە کەروێشکی ڕاو دەکرد، ڕەنگە ئاسکێکیشی وەبەر تیر دابێ، و ناچار بوو زۆر زووتر لەو کاتەی پێویست بوو ژنێکی جیرانیان بهێنێ و بەر لە کاتی خۆی منداڵێکی ببێ. ئەم بەسەرهاتە ئەوی بە دووی چارەنووسی خۆیدا نارده لەندەن. بە ڕواڵەت زەوقێکی لە بمواری شانۆدا هەبووە. کارەکەی خۆی بە مەیتەری و بەخێوکردنی لە ئەسپەکان لە بەر دەرکەی هۆڵی شانۆ دەسپێکرد. خێرایەکی کارێکی لە ناو هۆڵەکە وەدەست خست، بووە ئەکتەرێکی سەرکەوتوو و لە ناوەندی جیهان ژیا. چاوی بە هەموو کەسێك دەکەوت، هەموو کەسێکی دەناسی، هونەرەکەی لە سەر شانۆ و هۆشی خۆی لە سەر شەقام بە تاقی دەکردەوە و تەنانەت گەیشتە کۆشکی شاژن. وای دابنێین لەم نێوانەدا

خوشكە خاوەن توانا و مرخە لە ڕادەبەدەرەكەی لە ناو ماڵدا مابووەوە. ئەویش بە قەرا براكەی شەڕانی و داهێنەر بوو و حەزی لە گەڕانی دونیا دەكرد. بەڵام ئەویان نەنارده قوتابخانە. و بەختێكی نەبوو بۆ فێربوونی ڕێزمان و مەنتق، جا نەخوازە بەرهەمەكانی هوراس و ڤیرژیل بخوێنێتەوە. جار و بارێك دەستی دەدا كتێبێك، لەوانەیە یەكێ لە كتێبەكانی براكەی و چەند لاپەڕەیەكی دەخوێندەوە. بەڵام لەو كاتەدا دایك و بابی سەریان هەڵدەدا و پێیان دەگوت گۆرەوییەكان بدوورێتەوە یان ئاگای لە چێشەكە بێ نەسووتێ و هێندە خەریكی كتێب و قاقەز نەبێ. ئەوان بە تووڕەیی و بە خۆشەویستیەوە بە سەریدا دەهاتن، لەبەر وەی مرۆڤگەلێكی خاس و باش بوون و لە بارودۆخی ژیانی ژنێك دەگەیشتن و كچەكەیان خۆش دەویست-لە ڕاستیدا بە ئەگەرێكی زۆر سۆمای چاوانی بابی بوو. ڕەنگە بە دزییەوە لە عەمباری سێوی چەند لاپەڕەیەكی ڕەش دەكردەوە، بەڵام وریا بوو كە بیانشارێتەوە یان بیانسووتێنێ. كەچی، زۆر زوو، بە مێرمنداڵی، بڕیار درا ببێتە دەسگیرانی كوڕی بازرگانێكی پەشمی جیرانیان. هاواری كرد قینی لە مێردكردنە، لەبەر ئەوە بابی چینێكی باشی كوتا. پاشان دەستی لە لۆمەكردنی هەڵگرت. لێی پاڕاوەو و ڕیشی لە بەر گرت بابی خۆی ئازار نەدات و لە بەر ئەم شووكردنە ئابڕووی نەبات. باوكە بە چاوی پڕ لە فرمێسكەوە بڕیاری ملبەندێك یان كراسێكی جوانی پێدا. كچە چلۆن دەیتوانی جوابی بابی نەداتەوە؟ چلۆن دەیتوانی دڵی بابی بشكێنێ؟ تاقە هێزی مرخ و تواناییەكەی دنەی دەدا بۆ ئەم كارە. كەل و پەلەكەی دانا ناو بوخچەیەكی بچووكەوە ولە شەوێكی هاویندا بەیارمەتی تەنافێك لە پەنجەرەوە چووە خوار و ڕێگەی لەندەنی گرتە بەر. هێشتا حەڤدە ساڵیشی نەبوو. دەنگی باڵندەكانی ناو دار و دەوەنەكە لە هی ئەو خۆشتر نەبوون. هێزی خەیاڵێكی سەیری هەبوو، تواناییەك وەك توانایی براكەی لە موسیقای كەلامدا. ئەویش وەك براكەی زەوقی شانۆی هەبوو. لە بەر دەركی هۆڵی شانۆكەدا ڕاوەستا. گوتی پێی خۆشە ببێتە ئەكتەری شانۆ. پیاوان پێی پێكەنین. بەڕێوەبەری شانۆ پیاوێكی قەڵەو و دەم قووچاو-قاقای كێشا. بە هەرا هەراوە شتێكی سەبارەت بە سەماكردنی سەگ و شانۆگێڕی ژنان گوت. گوتی مەحاڵە هیچ ژنێك ببێتە ئەكتەر. خۆتان دەتوانن بیهێننە بەر چاوتان چ تانەیەكی لێدا. خوشكی شێكسپیر نەیدەتوانی بۆ پەروەردەكردنی هونەرەكەی خۆی ڕاهێنانێكی هەبێت. ئایا تەنانەت دەیتوانی لە مەیخانەیەك خواردنێكی دەسكەوێت یان نیوە شەو بە شەقاماندا بسووڕێتەوە؟ بەم حاڵەشەوە، شارەزاییەكی لە بواری چیرۆكدا هەبوو و پێی خۆش بوو نوقمی ژیانی ژنان و پیاوان و خوێندنەوەی ڕێو شۆینەكەیان بێت. لە كۆتاییدا، چونكە زۆر گەنج بوو و سەیریش شێوەی براكەی دەدا — هەر بەو چاوە خۆڵەمێشی و برۆ كەوانیانەوە — نیك گرین، سەرۆكی

ئەکتەرەکان بەزیی پێیدا هات و جودیت زگی لەو کابرایە پڕ بوو وە پاشان-کێ دەتوانێ ئەو قین و داماویەی دڵی شاعیرێك وا لە ناو لەشی ژنێکدا بەند کراوە بپێوێ؟ لە شەوێکی زستاندا خۆی کوشت و ئێسێتەکە لەو چوار ڕێیانەی وا ئوتوبوسەکان ( پاسەدرێژەکان ) لێی ڕاوەدەوەستن، لەو شوێنەی شەقامی کەسێل"[٩٠]" و ئێلێفەنت"[٩١]"بە یەك دەگەن، نێژراوە.

پێموایە ئەگەر ژنێك لە سەردەمی شێکسپیردا لێهاتوویی شێکسپیری هەبوایە، چارە نووسەکەی کەم تا کورت هەر ئەوە دەبوو. بەڵام من بە بەشی خۆم لەگەڵ ئۆسقۆفی ڕەحمەتی دا هەم، هەڵبەت ئەگەر بە ڕاست ئۆسقۆف بووبێ. بیر لێ کردنەوەشی هەر مەحاڵە کە ژنێك لە سەردەمی شێکسپیردا مرخ و توانایی شێکسپیری هەبووبێ. لە بەر وەی لێهاتوویەکی وەك لێهاتوویی شێکسپیر لە نێوان کرێکاران و نەخوێندەواران و خزمەتکاراندا پێك نایەت. ئەم مرخە لە بەریتانیا لە نێوان ساکسۆنەکان و بریتۆنەکاندا پێك نەدەهات. ئەوڕۆکە ئەم مرخە لە ناو چینی کرێکاردا پێك نایەت. کەواتە چۆن دەکرا لە نێو ژنانێکدا سەر هەڵدا کە، بە قسەی پرۆفسۆر ترێویلیان، ئیشەکەیان بەر لە کۆتایی هاتن بە مێرمنداڵیان دەستی پێدەکرد و زۆرلێکردنی گەورەکانیان و دەسەڵاتی یاسا و دابونەریتی کۆمەڵگە وای لێدەکردن ملی بدەنە بەری؟ ئاواش، خاترجەم جۆرە لێهاتوویەك لە نێو ژناندا هەبوە، هەر بەو جۆرەی کە بە دڵنیاییەوە لە نێو چینی کرێکارانیشدا هەبووە. جار جار ڕابێرت بۆرنز"[٩٢]"یان ئێمیلی  برۆنتێیەك وە دەردەکەون و بوونی خۆیان دەسەلمێنن. بەڵام بێ شك ئەم مرخە قەت نەخراوەتە سەر قاقەز. بەم حاڵەشەوە، کاتێك ئەوە دەخوێنینەوە کە ژنێکی سیحربازیان لە ناو بردوە، یان ژنێك جنۆکە گرتوویەتی، یان ژنێکی ئاوەزمەند دەرمانی گیایی دەفرۆشێت، یان تەنانەت پیاوێکی مەزن دایکێکی هەیە، لەو کاتەدا ئەوەمان وەبیر دەکەوێتەوە دەتوانین شوێنەوارێك لە رۆماننووسێکی ونبوو، یان شاعیرێکی سەرکوتکراو، یان جین ئاستەنێکی بێدەنگ، یان ئێمیلی برۆنتەیەك ببینینەوە کە بە هۆی ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی وا بە دەست مرخ و لێهاتوویەکەیەوە دیویە سەری خۆی هەڵگرتووە و داویەتە کێوی. لە ڕاستیدا، لەم ئەندێشەیەدا ئەوندە بەرەو پێش دەچم کە پێموایە «گومناو»"[٩٣]"، وا ئەو گشتە شێعرە بێ واژووەی گوتوە، زۆر جاران ژن بووە. پێموایە فیتز جیراڵد بوو گوتی: ژن شێعری

---

90-Castle
91-Elephant
92-Robert Burns
93-Anon

عەوامانە و لای لایەی گوت تاوەکوو منداڵەکانی بخەوێنێت، یان لە کاتی تەشی ڕستندا خۆی سەرقاڵ کات، یان بۆ خۆڕاگرتنی لە بەر شەوگاری درێژی زستان.

لەوانەیە ئەم شتە ڕاست بێت و لەوانەشە ناکێ دەزانێ؟ بەڵام ئەو شتەی حەقیقەتی هەیە، ئەوەی وا لە پاش گێڕانەوەی چیرۆك سەبارەت بە خوشکی شێکسپیر بە زەینم گەیشت، ئەوەیە وا هەر ژنێك لە سەدەی شازدەدا بە لێهاتوویەکی سەیرەوە لە دایك دەبوو بە دڵنیاییەوە شێت دەبوو، خۆی دەکوشت، یان تەمەنی خۆی لە کۆڵێتێکی دەرەوەی گوندی لە تەنیایدا رادەبوارد، خەڵکی پێیان وابوو نیمچە سیحربازێك یان نیمچە جادووبازێکە، لێی دەترسان و گاڵتەیان پێدەکرد. لەبەر وەی بە نەختێ لێهاتوویی لە دەروون ناسیدا دەتوانی پەی بەوە بەری کە کیژێکی لێهاتوو وا هەوڵی دەدا مرخەکەی خۆی لە بواری شێعردا بخاتە گەڕ، هێندەی لەمپەر دەکەوتە سەر ڕێ و هێندە غەرایەزی ناتەبای خۆی ئازاری دەدا و لە ژوورەوە دەیانخواردەوە کە لەش ساخی و عەقڵی حەتمەن دەفەوتان. هیچ کچێك نەیدەتوانی بەبێ خۆ ئازاردان و ڕەنج کێشان و چەرمەسەرییەکی نامەنتقی، هەر چەندە بەناچاری، بچێتە لەندەن و لە بەر دەرکی هۆڵی شانۆ ڕابوەستێ و خۆی بڕێ بە سەر سەرۆکی ئەکتەرەکاندا. چونکە داوێن پاکی لەوانەیە وەسوەسەیەك بێ لە هەندێ کۆمەڵگەدا بە هۆگەلێکی نادیار سەری هەڵدابێ. داوێن پاکی لەو سەردەمەدا، و تەنانەت ئێستەکەش، لە ژیانی ژناندا بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە و وا تێکەڵی ئاو و خوێن و غەرایزیان بووە، کە بەر دان و پیشاندانەکەی لە بەر تیشکی ڕۆژدا غیرەتێکی بێ وێنەی دەوێت. ژیانی ئازاد لە لەندەنی سەدەی شازدە بۆ ژنێکی شاعیر و شانۆنامەنووس بە واتای گوشارێکی عەسەبی و کۆسپێك بوو، کە لەوانە بوو چۆکی پێدادات. ئەگەر بمابایەتەوە، گشت ئەو شتانەی دەینووسی پێچەوانە کراوە و عەیبدار دەبوو و دەبووە بەرهەمی خەیاڵاتی ئاڵۆز و نەخۆشی ئەو و بە دەم چاو گێڕانم بە قەفەسەکانی شانۆنامەکانی ژناندا، لە بەر خۆمەوە گوتم بێ گومان بەرهەمەکانی بێ واژوو دەمانەوە. ئەمە سووچێکی ئەمین بوو، کە بەدڵنیاییەوە پەنای بۆ دەبرد. ئەو شتەی تەنانەت تا سەدەی نۆزدە گومناوی بە سەر ژناندا دادەسەپاند، هەر هەمان پاشماوەی داوێن پاکی بوو. کورێر بێل"[٩٤]"، جۆرج ئیلیۆت، ژۆرژ ساند، وا هەموویان بە شاهێدی نووسراوەکانیان بوونەتە قوربانی ململانێ دەروونییەکان، لەخۆڕا هەوڵیان دا بە کەڵکوەرگرتن لە ناوی پیاوان خۆیان لەوبەری دەمامکێکەوە بشارنەوە. ئەوان ئاوا بەم جۆرە ڕێزیان دەگرت لەو نەریتەی وا ناوبانگی بۆ ژنان پێ دزێو و ناحەز

94-Corer Bell

بوو، نەریتێك وا پیاوان زۆر باش پشتیوانیان لێ دەكرد، تەنانەت هەر چەندە ئەوانیش دایان نەنابوو. (پریكلێس، ئەو پیاوەی وا خۆی زۆر بە ناوبانگ بوو، دەیگوت گرنگترین سەركەوتوویی بۆ ژن ئەوەیە لە بارەیەوە قسان نەكرێت.) گومناوی لە ناو دەمارەكانی ژناندا دەگەڕێت. هێشتاش حەز كردن لە خۆ داپۆشین هەڵیان دەخەڵەتێنێ. تەنانەت هەنوكەش بە قەرا پیاوان پەرۆشی ناوبانگی باشی خۆیان نین، و بە گشتی لە پەنا بەردە قەبر یان تابلۆیەكی چێوینەوە ڕادەبوورن بێ وەی ئیشتیایەكی زۆریان لێ بێ بۆ هەڵكۆڵینی نێوی خۆیان لە سەری، ئەو كارەی ئالف"[٩٥]"، بێرت"[٩٦]"، یان چەس"[٩٧]"دەبوو بە وەدوو كەوتنی غەریزەی خۆیان بیانكردایە. ئەم غەریزەی كاتێ ژنێكی جوان یان تەنانەت سەگێك لە كاتی تێپەڕیندا دەبینێ، بە سرتە دەڵێ ئەم سەگە هی منە. لەبەر خۆمەوە گوتم، هەڵبەت لەوانەیە سەگ نەبێ، و گۆڕەپانی پارلمان، شەقامی سیجز"[٩٨]"و شەقامەكانی ترم كەوتەوە یاد، لەوانەیە لەتە عەرزێك یان پیاوێك بێ بە قژێكی لوولی ڕەشەوە. ئەمە یەكێكە لە گرنگترین ئیمتیازەكانی ژنبوون، ئەوەی كە دەتوانێ لە پەنا ژنێكی جوانی ڕەش پێستەوە تێپەڕێ بێ وەی بیهەوێت بیكاتە خاتوونێكی ئینگلیسی.

كەواتە ئەو ژنەی لە سەدەی شازدەیەمدا بە توانایی شاعیر بوونەوە لە دایك دەبوو ژنێكی خەمۆكی بووە، ژنێك وا شەڕی لەگەڵ خۆی دەكرد. گشت بارودۆخەكەی ژیانی، هەمو غەریزەكانی، دژایەتی و شەڕیان دەكرد لەگەڵ زەینییەتی، ئەو زەینییەتەی پێداویستی بوو بۆ ئازادكردنی تەواوی ئەو شتانەی وا بیری لێ دەكردنەوە. لە خۆمم پرسی، بەڵام باشترین زەینییەت بۆ داهێنان چیە؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێ لەو زەینییەتە بگات وا داهێنان، ئەم ئیشە سەیرە دەكات و بەرەو پێشەوەی دەبات؟ لەم كاتەدا كتێبی تراژێدیەكانی شێكسپیرم هەڵداوە. بۆ وێنە زەینییەتی شێكسپیر لە كاتی نووسینی لیرشا یان ئانتۆنی یان كلیۆپاترادا چ بووە؟ خاترجەم گونجاوترین زەینییەتێكی داهێنەر، كە تا ئەوڕۆكە لە بواری شێعردا هەبووە. بەڵام خودی شێكسپیر هیچی سەبارەت بەوە نەگوتوە. تاقە لە ڕووی هەڵكەوتەوە دەزانین وا قەت هێڵێكیشی نەسڕیوەتەوە. لە ڕاستیدا، وێدەچێ تا سەدەی هەژدەیەم هۆنەرمەندەكە قەت هیچی سەبارەت بە زەینییەتی خۆی نەگوتبێ. پێموا ڕۆسۆ بوو ئەو كارەی دەست پێكرد. هەر چۆنێك بێ، لە سەدەی هەژدەیەمدا خۆناسینەوە هێند بەرەو پێش چوو، كە بووە باو پیاوانی ئەدیب لە دانپێدانان و ژیننامە تاكە كەسیەكانی خۆیاندا باسی

---

95-Alf
96-Bert
97-Chas
98-Sieges

زەینییەتی خۆیان بکەن. لە پاش مەرگیشیان ژیان نامەکانیان دەنووسین و نامەکانیان بڵاو دەکردنەوە. کەواتە، ئەگەر نازانین لە کاتی نووسینی شالیر شێکسپیر چی لێهاتووە، دەزانین کاتی نووسینی شۆڕشی فەڕانسە کارلایل چۆن بووە، دەزانین فلۆبێر لە کاتی نووسینی مادام بۆڤاریدا چی لێهاتووە. دەزانین کیتس لە کاتی هۆنینەوەی هۆنراوەکانی لە بەربەرەکانیکردنی ئاوڕنەدانەوەی دونیا لە کاتی سەرەمەرگدا تووشی چ چەرمەسەریەك بوو.

لەم ئەدبیاتە نوێ و بەربڵاوەی دانپێدانان و لێکدانەوەی خۆیانەوە ئەوەها تێدەگەین، کە نووسینی بەرهەمێکی دەگمەن لە گشت کاتێکدا زۆر لە کارێکی ئەستەم و دژوار دەچێت. تەواوی شتەکان لەگەڵ دۆخی هاتنەدەرێی بەرهەم بە تەواوی و پوخت و پاراوی لە زەینی نووسەرەوە دژایەتی دەکەن. بە گشتی، بارودۆخی مادی دژیانە. سەگەکان دەوەڕن خەڵکی ئازاریان دەدەن دەبێ بە دووی داهات دەرهێنانەوە بێ لەش ساخی تێکدەچێ. جگە لەمە، ئەو شتەی تەواوی ئەم کێشانە پتر و تاقەت هێنانەکەی ئەستەمتر دەکات، ئاوڕ نەدانەوەی بەرچاوی جیهانی دەوروبەرە. دونیا داوا لە خەڵکی ناکات شێعر و ڕۆمان و مێژوو بنووسن دونیا پێویستێکی بەمانە نییە. لای دونیا بایەخێکی نییە کە فلۆبێر وشەی گونجاو ببینێتەوە، یان کارلایل بە وردی و ڕاڕا لێکردن ئەم یان ئەو ڕاستەقینەیە بسەلمێنێ. و ئاساییە هیچ نادا بەو شتەی کە نایهەوێ. کەواتە نووسەر، کیتس، فلۆبێر، کارلایل، بە تایبەت لە ساڵە داهێنەرەکانی گەنجیەتیدا لەگەڵ گشت چەشنە کۆسپ و ئازار و دڵساردیەك بەرامبەر دەبێتەوە و ڕەنج دەکێشێ. لە کتێبەکانی لێکدانەوەی خۆ و دانپێدانانەکانەوە، نفرینێك، هاوارێکی بەژان دێتە گۆی. «شاعیرانی گەورە بە داماوی دەمرن. ئەمە بارێکی قورسە وا شێعر لە سەر شانی داناون. ئەگەر شتێك، بە سەر ئەم هەموو کێشەیەدا، بنووسرێ، مۆعجیزەیە و ڕەنگە هیچ کتێبێك تەواو و بێ عەیب، بەو جۆرەی لە زەینی نووسەردا بووە، نەنووسرێ.

بە دەم چاو لێکردنم لە قەفەسە بەتاڵەکان بیرم لەوە دەکردەوە، بەڵام ئەم کێشانە خاترجەم بو ژنان زۆر ئەستەمتر بووە. لە قۆناغی یەکەمدا، تەنانەت تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم ژن ژوورێکی بۆ خۆی پێ ڕەوا نەدەبینرا جا نەخوازە ژوورێکی هێمن و بێدەنگ، مەگین دایك و بابی زۆر دەسڕۆیشتوو نەجیب زادە و پایەبەرز بووبن. لە بەر ئەوەی کە پووڵی ناو گیرفانی، بە مەزنایەتی بابی بەند بوو، هەر بەشی کڕینی جل و بەرگەکەی دەکرد، و لەو شتانەی وا تەنانەت پیاوانێکی هەژاری وەك کیتس، تنیسۆن یان کارلایل هەیانبوە بێبەش بوو. بە پیاسە گەڕان، سەردانێکی کورتی فەرانسە، شۆینێکی سەربەخۆ بۆ حەوانەوە، هەر چەندەش زۆر هەژارانە و کلۆڵ، کە لە سایەیدا لە دەس داواکاری و زۆرە ملیەکانی بنەماڵەکانیان بحەسێنەوە. ئەم چەشنە قەیرانە

ئابوورییانە ترسهێنەر بوون، بەڵام قەیرانە مەعنەوییەکان زۆر لەوانە دژوارتر بوون. ئاوڕنەدانەوەی جیهانی دەورووبەر، وا کیتس و فلۆبێر و پیاوانی تری هونەرمەند زۆر بە دژواری لە بەری تاقەتیان دەهێنا، ئیتر سەبارەت بەو ئاوڕ نەدانەوە نەبوو، دوژمنایەتی و ناکۆکی بوو. دونیا بەوی وەك پیاوان نەدەگوت ئەگەر پێتخۆشە بنووسە، بۆ من جیاوازیەکی نییە. بەڵکو بە دەم قاقا لێدانەوە دەیپرسی دەتهەوێ بنووسی؟ نووسراوەی تۆ بە کەڵکی چی دێت؟ هەر وا کە سەیری جێگە بەتاڵەکانی قەفەسەکانم دەکرد، لە بەر خۆمەوە گوتم، ڕەنگە لێرەدا دەروونناسانی نیوهام و گەرتن بە هانامانەوە بێن. لەبەر ئەوەی بە دڵنیاییەوە کاتی ئەوە هاتوە کە کاریگەریی دڵساردی لە سەر زەینی هونەرمەند پێوانە بکەین، هەر بەو چەشنەی دیبووم کارخانەیەکی بەرهەمهێنی شیرەمەنی کاریگەری شیری پلە یەك و شیری ئاسایی لە سەر گیانی مشکێك پێوانە دەکرد. ئەوان دوو مشکیان لە دوو قەفەسدا لە پەنا یەکتری دانا. یەکیان شەرمن و چکۆلە بوو، ئەوی دیکەیان ئازا و گەورە وریشەی دەهات. لە کاتێکدا لەوانەیە وەبیری شێوی هەڵووژە و کاستێرد کەوتبێمەوە، لە خۆمم پرسی، ئێستەکە چ خواردنێك دەرخواردی ژنانی هونەرمەند دەدەین؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەوندەی دەویست ڕۆژنامەی ئێوارە هەڵدەمەوە و ڕای لۆرد بیرکەن بخۆینمەوە —بەڵام ڕاستیتان دەوێ بە هیوا نیم ڕای لۆرد بیرکەن سەبارەت بە ژنانتان بۆ بگێڕمەوە. خۆم لە قسەکەی دین ئینگیش کەڕ دەکەم. کارناسی شەقامی هارلی دەتوانێ قسەکانی شەقامی هارلی بە هات و هاوار و زمان لووسیەوە بگێڕێتەوە بێ وەی کە تۆزێ لە قسەکانی سەرم سووڕ بمێنێ. بەڵام شتێکتان لە جەنابی ئۆسکار براونینگ بۆ دەگێڕمەوە، چون جەنابی ئۆسکار براونینگ سەردەمانێك لە کەمبریج بۆ خۆی بێنە و بەرەیەکی بوو، و تاقیکردنەوەی لە خوێندکارانی گەرتن و نیوهام وەردەگرت. ئاغای ئۆسکار براونینگ خووی بەوە گرتبوو ئاوا بڵێ «لە پاش چاکردنی هەر کۆمەڵە لاپەڕەیەکی تاقیکردنەوە، ئەو شتە لە زەینی ئەودا دەمێنێتەوە، کە بەبێ لەبەر چاو گرتنی ئەو نومرەیەی وا بە هەر لاپەڕەیەکی دەدات، باشترین ژن لە باری فیکریەوە لە خراپترین پیاو چروکترە. ئاغای براونینگ لە پاش گوتنی ئەم قسەیە گەڕاوە ماڵی خۆیان-و ئەوە درێژەی کارەکەیەتی خۆشەویستی دەکات و کەسایەتیەکی بە ڕواڵەت گەورە و گرنگی لێ دروست دەکات. ئەو گەڕاوە ماڵە خۆیان و دیتی کوڕە مەیتەرێ لەوێ لە سەر قەنەفەکە ڕاکشاوە «هەر ئێسك و پێست بوو، گوپەکانی بە قوڵدا چوبوون و ڕەنگی هەڵبزرکاو و ددانەکانی ڕەش بوون، وا دیار بوو نەیدەتوانی دەست و لاقی باش بجووڵێنێ...{ئاغای براونینگ} گوتی: «ئەمە ئارتورە... بە ڕاستی کوڕێکی نازدار و بە هۆشە.بە ڕای من، گشت کاتێك ئە دوو وێنەیە یەکدی تەواو دەکەن و

بەختەوەرانە لەم سەردەمی ژیاننامەنووسینەدا ، ئەم دوو وێنەیە بە ڕاستی یەکتر تەواو دەکەن، بە چەشنێ، کە دەتوانین ڕا دەربڕینەکانی کەڵە پیاوان نەك تاقە لە ڕوی ئەو شتەی کە دەیڵێن، بەڵکە لە ڕووی ئەو شتەی وا دەیکەن لێکی دەینەوە.

بەڵام، لە چاو ئەوەی کە ئەوڕۆکە هەلی لێکدانەوەی لەم چەشنە هەیە، ڕا دەربڕینێکی ئاوا لە زاری کەسانێکی گرینگ ڕەنگە تەنانەت پەنجا ساڵیش لەمەوبەر بێ هەر کاریگەرییەکی زۆر چاکی هەبووە. وای دابنێین باوکێك لە بەر ئەنگیزەیەکی مەزن پێی خۆش نەبێ کیژەکەی لە ماڵ بچێتە دەر و ببێتە نووسەر، نگارکێش یان لێکۆڵەر. بە کچەکەی دەگوت: «چاولێکە بزانە ئاغای براونینگ چی دەڵێ. خۆ هەر تاقە ئاغای براونینگ نەبوو، حەوتەنامەی سەتێردی ریوریوش بوو ئاغای گرێگ"[99]"یش بوو ئاغای گرێگ بە پێداگریەوە دەیکوت: «گشت هەبوونی ژنان لەوەدا کۆتا دەکرێتەوە کە لە ژێر چاوەدێری پیاواندان و خزمەتی پیاوان دەکەن. کۆلێك لە ڕا دەربڕینەکانی پیاوان لە سەر ئەم بنەمایە بوو کە ناکرێ لە باری فیکریەوە هیچ چاوەڕوانییەکت لە ژنان هەبێ. تەنانەت ئەگەر بابی کچێك ئەم ڕا دەربڕینانەی بە دەنگێکی بەرز نەخوێندبایەتەوە، کیژ بۆ خۆی دەیتوانی ئەمانە بخوێنێتەوە، و خوێندنەوەی ئەم بیر و ڕایانەش تەنانەت لە سەدەی نۆزدەیەمیشدا، بە دڵنیاییەوە لە گەشە و نەشەی دەخست و کاریگەرییەکی زۆری لە سەر کارەکەی دادەنا. لە سەر ئەم شتە هەردەم جەخت دەکرا -«تۆ ناتوانی ئەم کارە بکەی، و بەرگەی ناگری.-ئەو جەخت کردنەوەیەی کە دەبوو دەنگی لێ هەڵبڕی و زاڵ بی بە سەریدا. لەوانەیە ئەم میکرۆبە ئیتر کاریگەرییەکی وای بە سەر ڕۆماننووسەوە نەبێ، لەبەر ئەوەی ژنانێکی ڕۆماننووسی گەورە هەڵکەوتون. بەڵام ڕەنگە هێشتا کاریگەرییەکی ڕووخێنەری لە سەر نیگارکێشان هەبێ. و پێموایە سەبارەت بە موسیقازانەکان، تەنانەت لە هەنووکەدا، زۆر کاریگەر و کوشەندەیە. هەلومەرجی ژنێکی ئاواز دانەر هەر هەمان هەلومەرجی ژنی ئەکتەر لە سەردەمی شێکسپیردایە. وە بیر ئەو چیرۆکە کەوتمەوە وا سەبارەت بە خوشکی شێکسپیر سازم کردبوو بیرم لەوە کردەوە، نیك گرین گوتویە، شانۆگێڕی ژن وەبیر سەماکردنی سەگی دەخاتەوە. جانسۆن دووسەد ساڵ دواتر ئەم قسەیەی سەبارەت بە ژنانی وتەوان دووپات کردەوە. و من لەم کاتەدا کتێبێکم سەبارەت بە موسیقا هەڵداوە و گوتم: لەم ساڵە پیرۆزەدا، واتە ١٩٢٨، ڕێك هەمان وشەگەل دەگوترێتەوە سەبارەت بەو ژنانەی وا ئاواز دادەنێن. «سەبارەت بە خاتوو ژێرمەن تایفەر"[100]"هەر دەکرێ

99-W. R. Greg(١٨٠٩-٩١٩١)

100-Germaine Taillerferre

نموونەکەی ئاغای جانسۆن سەبارەت بە ژنانی قسەکەر دووپات بکەیتەوە و پەرەی بدەیتە جیهانی موسیقاوە. کاکە، ئاواز دانان بۆ ژن وەك ڕۆیشتنی سەگە لە سەر دوو لاقی دواوەی. ئەوندە شتێکی تاریفی نییە، بەڵام ئەوە زۆر سەیرە هەر دەشکرێ."[101]"مێژوو سەرلەبەر خۆی دووپات دەکاتەوە.

کەواتە ژیاننامەی ئاغای ئۆسکار براونینگم داداوەو کتێبەکانی ترم خستە لایەکەوە، و لە بەر خۆمەوە کوتم، ڕوونە کە تەنانەت تا سەدەی نۆزدەیەمیش هیچ ژنێك دنە نەدەدرا بۆ ئەوەی ببێتە هونەرمەند. بە پێچەوانە، دەشکاوە، زللەی وێدەکەوت، بە سەریدا دەهاتن و دەکەوتە بەر هەڕەشە. حەتمەن مێشکی لەبەر پێویستبوونی بە دەنگ هەڵبڕین بەم و دژایەتیکردن لەگەڵ ئەو دەتەقی و گوڕ و تینەکەی کز دەبوو. لەبەر وەی لێرادا دیسان دەکەوینەوە بەر هەمان"[102]"تیشکی لێڵ و زۆر سەیری عوقدەی پیاوەتی کە کاریگەرییەکی زۆری هەبوە لە سەر بزووتنەوەی ژنان هەمان ئاوات و خواستە ڕیشەدارەکە، نەك لەبەر وەی ژن سوك و ژێرە دەست بێ، و ئەوەی کە پیاو لە سەرتر بێ، و ئەم بابەتە پیاو لە گشت بوارێکدا دەخاتە بەرامبەرمان، نەك هەر لە بواری هونەردا، بەڵکو لە بواری ڕامیاریشدا ڕێگە دەگرێ، تەنانەت ئەو کاتەی لەوە دەچێ مەترسیەکە زۆر زۆر کەمە و ژنی خوازیار بێ دەمارە و بە وەفا. وە لە بیرم هاتەوە کە تەنانەت خاتو بێز بۆراش، بەو گشتە هۆگریەی بە سیاسەتەوە، دەبێ خاکەڕایانە سەر دانەوێنێ و بۆ لۆرد گرانویل لێویسۆن گاوئێر ئاوا بنووسێ: «...هەر چەندە هەم سیاسەت و هەم ئەو قسانەی سەبارەت بە سیاسەت، زۆری دەکەم زۆرم پێخۆشن، بە تەواوی لەگەڵ ئێوەدا هەم کە هیچ ژنێك نابێ دەست لەم بوارە یان کارە شێلگیرانەکانی ترەوە وەربدات، مەگین بیهەوێ ڕای خۆی دەربڕێ (هەڵبەت بە مەرجێ لێیان بوێت.) کەواتە ئەو دەچێت تا حەز و تاسەکەی خۆی بخاتە بوارێك کە هیچ لەمپەرێکی لە بەر ڕێ نییە، واتە یەکەمین گوتە بێژی لۆرد گرانویل لە مەجلیسی عەوامدا. بیرم لەوە کردەوە ئەم دیمەنە بە دڵنیاییەوە دیمەنێکی سەیرە. مێژوی دژایەتیکردنی پیاوان لەگەڵ ئازادیی ژنان پێموا لە خودی چیرۆکی ئەم ئازادییە سەرنجڕاکێشترە. ئەگەر خۆیندکارێکی گەنج لە گەرتن یان نیوهام بەڵگە گەلێك کۆ کاتەوە و بە بیرۆکەیەك بگات، لەوانەیە بکرێ کتێبێکی سەرنجڕاکێش لەم بوارەدا بنووسرێ. بە لام ئەم خۆیندکارە پێویستی بە دەسکێشی ئەستور و میلەی زێری پەتی دەبێ تاوەك بیپارێزن.

---

101-A Survey of contemporary Music, CecilGray,P. 246

١٠٢- Lady Henrietta Besborogh (١٧٦١-١٨٢١)، کەنتس بێزبۆرا، وا لە بنەوە دڵبەری لۆرد لێویسۆن گاوئێر(١٧٧٣-١٨٤٦)، گەورە سیاسەتمەداری ئینگلیسی، بوو و نامەگەلێکی زۆری بۆ نووسی.و.ف

کاتیێ کتێبەکەی لیدی بێزبۆرام دادەداوە، بیرم لەوە کردەوە، بەڵام ئەو شتەی ئەوڕۆکە خۆش و سەرنجڕاکێشە، حەتمەن سەردەمانێك بە توند وتیژ و شێلگیرانە دادەندرا. دڵنیا بن ئەو بیر و ڕایانەی وا ئێستەکە دەکرێ بیخەیتە ناو کتێبێکەوە و نێوێکی قۆڕی لە سەر دابنێی و هەڵیگری بۆ خۆیندنەوەی بەردەنگە تایبەتەکانی شەوگاری هاوین، سەردەمانێك فرمێسکی لە چاوی خەڵکی هێناوە. لە ناو داپیرە و دایە گەورە گەورەکانی ئێوەدا زۆرن ئەو ژنانەی بە بیستنەکەیان هۆڕ هۆڕ گریاون. فلۆرانس نایتینگێل لە داخدا قیژاندویەتی."[١٠٣]" جگە لەمە، بۆ ئێوە کە خۆتان گەیاندوەتە زانکۆ و ژوورێکی دانیشتن-یان ڕەنگە ژوورێکی خەوتنتان؟ -بۆ خۆو هەیە، هاسانە بڵێن بلیمەتەکان نابیێ گۆی بدەنە ئەو بیر و ڕایانە، بلیمەتەکان دەبێ لەوە لەسەرتر بن کە بایەخ بدەنە ئەو قسانەی وا پێیان دەڵێن. لە ڕۆژە ڕەشی ئەمە هەر ڕێك ژنان و پیاوانی بلیمەتن وا لە ڕادەبەدەر گرینگی دەدەنە ئەو شتەی پێیان دەگوترێ. کیتس بهێننەوە بیرتان و ئەو وشانەی بە ویستی خۆی لە سەر بەردی قەبرەکەی هەڵیان قەند. بیر لە تنیسۆن بکەنەوە — بەڵام پێویست ناکات نمونەی جۆراوجۆرتان لەم ڕاستەقینە حاشا هەڵنەگرە، و هەر چەندە جێگەی داخ، بۆ بگێڕمەوە ئەم ڕاستەقینەیە وا ئاساییە هونەرمەند زۆر بایەخ بداتە ئەو شتەی پێی دەڵێن. ئەدبیات پڕە لە کەلاکی وردبووی ئەو پیاوانەی لە ڕادەبەدەر گرینگیان داوە بە ڕای ئەوانیتر.

جارێکی تر چومەوە سەر پرسیارەکەی خۆم وا کامە زەینییەت بۆ داهێنان گونجاوترە بیرم لەوە کردەوە، ئەم هەستیاریەی ئەوان ڕۆژە ڕەشیەکی دووهێندەیە. لەبەر ئەوەی زەینی هونەرمەند دەبێ بۆکردنی ئەو کارە گەورەیە، واتە ئازادکردنی تەواوەتی ئەو بەرهەمەی لە ناخیدایە، پڕ لە ئاژاوە و هەرا و هاوار بێ. چاوم لەو کتێبە کرد وا لە بەشی ئانتۆنی و کلیۆپاترادا هەڵمدابووەوە و لە بەر خۆمەوە گوتم، وەك زەینی شێکسپیر. نابێ هیچ لەمپەرێك، هیچ ماکێکی دەرەکی نەپاڵێوراوی تێدابێ.

چونکە هەرچەندە دەڵێین هیچ شتێك سەبارەت بە زەینییەتی شێکسپیر نازانین، تەنانەت لەو کاتەدا ئەم قسەیە دەهێنینە سەر زار، شتێك سەبارەت بە زەینییەتی شێکسپیر دەڵێین. ڕەنگە ئەوەی سەبارەت بە شێکسپیر زۆر کەم دەزانین —لە چاو دان"[١٠٤]"، بێن جانسۆن یا میلتۆن بگەڕێتەوە سەر ئەوەی کینە، دوژمنایەتیکردن و بێزاریەکانیمان لە بەر چاو نییە. هێچ چەشنە

---

١٠٣-چاو لەوە کەن:

Cassandra, by Florence Nightingale, printed in The Cause, by R. Strachey

104-John Donne

«له هەڵڵادانێك» كه ئێمه وەبیر نووسەر بخاتەوە، ڕێگەمان پێ ناگرێت. هیچ چەشنه مەیلێ له دەنگهەڵبڕین، مەوعیزە، داواكردنەوەی زیانه لێكەوتوەكان، حیساب یەكلا كردنەوە، داواكردن له دونیا بۆ شایەتیدان له سەر پەژاره و لێقەومانێك، له ناخیەوه بەرەو دەرێ حەوا دراوەوە و هاتووەته دی. واته شێعرەكەی به ئازادی و بەبێ تەگەره دێته دەر. ئەگەر تا ئێستەكه كەسێك بەرهەمی خۆی به تەواوێت بەیان كردبێ، هەمان شێكسپیر بووە. بەدەم دووباره چوونەوەم بۆ لای قەفەسەی كتێبەكه، بیرم لەوە كردەوە، ئەگەر تا ئێسته زەینێكی پڕ له ئاژاوە و هات و هاوار و بێ كۆسپ و تەگەره بووبێ، هەمان زەینی شێكسپیر بووە.

# بەشی چوارەم

بەدڵنیاییەوە دیتنەوەی ژنێك بەو زەینییەتەوە لە سەدەی شازدەیەمدا مەحاڵ بوو. ئەوندەی دەوێ بیر لە بەردە قەبرەکانی سەردەمی ئێلیزابێت بکەینەوە، بەو هەمووە منداڵەوە وا بە دەستی هەڵپێکاوەوە چۆکیان داداوە و بیر لەو مەرگە لە ناکاوەیان بکەینەوە و ماڵەکانیان بەو ژوورە تەنگ و تاریکانەوە بهێنینە بەر چاو، تا لەوە بگەین هیچ ژنێك لەو سەردەمەدا نەیدەتوانی شیعر بڵێت. ئەو شتەی بە هیواین بیبینینەوە ئەمەیە، کە ڕەنگە دواتر خاتونێکی پایەبەرز کەڵکی لە ئازادی و ئاسایشی ڕێژەیی خۆی وەرگرتبێ و شتێکی بە نێوی خۆیەوە بڵاو کردبێتەوە و مەترسی ئەوەی وەك دێوێك تێی بڕواننی بە گیان ودڵ وەئەستۆ گرتبێ. پاشان، بە دەم ئەوەی کە بە پارێزەوە خوم لە «فێمێنیسمی بێ پەروا» ی خاتو ڕێبکا وێست"[١٠٥]"دوور ڕادەگرت، لە بەر خۆمەوە گوتم، هەڵبەتە پیاوان خۆ بە زل زان نین. بەڵکە پتر لە ڕووی هاو خەمیەوە ڕێز دەگرن لە تەقەلاکانی کۆنتێسێ بۆ شیعر هۆنینەوە. چاوەڕوانی ئەوە دەکرێ خاتونێکی پلە بەرز زۆر زیاتر لە خاتو ئاستەنێك یان خاتو برۆنتەیەکی گومناو لە هەمان سەردەمدا دڵگەرم بکرێت. بەڵام ئەم چاوەڕوانییەش هەیە وا هەستگەلێکی نامۆ وەك ترس و نفرەت، زەین و مێشکی شڵەژاندبێ و شۆین پێی ئەم پەشێویە بە شیعرەکانییەوە دیار بێ. لە بەر خۆمەوە گوتم بۆ وێنە ئەم خاتو وینچێلسیە، و دەستم دا کتێبە شیعرەکەی. ئەو لە ساڵی ١٦٦١دا لە دایك ببوو هەم لە بنەماڵەیکی فیۆداڵی و گەورەماڵدا لە دایك ببوو و هەمیش مێردی بە بنەماڵەیەکی وا کردبوو. منداڵی نەبوو شیعری دەگوت و ئەوندەی دەوێ دەفتەری شیعرەکەی بکەینەوە، تاوەك گۆیمان لە هاواری دەنگ هەڵبڕاینی قین هەستاوی لە مەڕ بارودۆخی ژنان بیت:

---

١٠٥-Rebecca West (١٨٩٢-١٩٨٣) ناوە ڕاستیەکەی سیسیلی ئیزابێل فێیر فیلد ( Cicily Isabel Fairfield) بووە ڕۆژنامەوان، ڕەخنەگر و ڕۆمان نووسی فێمێنیست و سوسیالیست وا هەم لە بزوتنەوەی مافی دەنگدانی ژناندا بەشداری کردوە و هەم لە گۆڤاری فێمینیستی فری وومەن (Free (Woman گوتاری نووسیەوە. ڕێبکا وێست لە سەردەمی خۆیدا بە فێمێنیستێکی توندڕەو دەهاتە ئەژمار. -و. ف

چەندە ژێرە دەست ماوین! ژێرە دەست لەبەر یاساگەلی چەوت
و خۆیندن چەندە باشترە تا وەك ببیە گەمەی دەستی سروشت
لە هەر چەشنە گەشە سەندنێکی زەینی بێبەش بووین،
ئەو شتەی چاوەڕوانیان لێمانە و بۆیان لە بەر چاو گرتوین تێنەگەیشتوویە
ئەگەر کەسێ لەوانیتر لە سەرتر بێ،
هێزی خەیاڵ و سەر خوازیەکەی سەرکوت دەکرێ
لایەنی بەرامبەر هێشتاش هێندە بە هێزە
وا هیوای گەشە ساندن قەت ناتوانێ بە سەر ترسەکاندا زاڵ بێت.

بە دڵنیاییەوە زەینی ئەو بە هیچ جۆرێك نەیتوانیوە «گشت لەمپەرەکان بسووتێنێ و لایان بات و خۆی داگیرسێ. بە پێچەوانە، نفرەت و نابەرامبەری ئازاری دەدات و ڕێی پێدەگرێ. بۆ ئەو مرۆڤایەتی بووەتە دوو گرووپ. پیاوان «لایەنی بەرامبەر» ترس و نفرەتی لێیان هەیە، لە بەر وەی هێزی ئەوەیان هەیە ڕێگەی بەرەو ئەو شتەی پێی خۆشە — واتە نووسین- لێبگرن.

مەخابن! ئەو ژنەی قەڵەم بەدەستەوە دەگرێت،
لەبەر چاوی ئەوانیتر شتێکی زۆر بێ چاوەڕووە،
ئەم گوناحە بە هیچ چاکەیەك قەرەبوو ناکرێتەوە.
پێمان دەڵێن سەبارەت بە ڕەگەز و ڕێوشۆینی خۆمان بە هەڵەدا چووین
منداڵ بوون، مۆد، هەڵپەرکێ، جل، کایە
ئەمانە ئەو هونەرانەن وا دەبێ بە هیوایان بین
نووسین، خۆیندنەوە، بیر کردنەوە، پرسیار کردن
وەك هەور سێبەر دەخاتە سەر جوانییەکەمان و کاتمان بە فیڕۆ دەدات،
و دەبێتە لەمپەری سەر ڕێی سەرکەوتوویەکانی لاویەتیمان،
و لە کاتێکدا بەڕێوبەرایەتی شەکەت هێنی ماڵی عەبدایەتی
بە ڕای هەندێك، گرینگترین هونەر و کەلکی ئێمەیە

له ڕاستیدا، ئەو دەبێ وای دابنێ ئەو شتەی دەینووسێ قەت بڵاو نابێتەوە و خۆشی بۆ نووسین هان بدات، دەبێ دڵخۆشی خۆی بە گۆرانییەکی خەماوی بداتەوە:

ستران بچرە بۆ چەند هاوالێك، بۆ خەمەکانت
تۆ هەرگیز بۆ باخەکانی ناوبانگ و شانازی ساز نەکرابووی،
بەو هیوایەی سێبەرەکانت زۆر تاریك بن، و لەوێ ڕازی و دڵخۆش بی.

بەڵام بێ شك ئەگەر بیتوانیایە زەینی خۆی لە چنگ نفرەت و ترس ڕزگار بکات و پەژارە و قینی لەسەر کەڵەکە نەکات، ئاگرەکەی دەروونی بەردەوام داییسا. جار و بارەیەك شیعری پەتی لە زار دێتە دەر:

وە لە ناو هاورێشمە کاڵەوە بووەکاندا،
گوڵە باخ چیتر بە چرپە هیچ ناچڕێ.

پۆپ و ئاغای موری حەقیان بوو بە سەر ئەم دێڕانەدا هەڵبڵێن، ئەم دێڕانەی وا دێڕی دیکە دەهێننەوە یاد و بە سەریاندا زاڵ دەبن:
ئێستەکە گوڵی شیلانە بە سەر زەینی کلۆڵدا زاڵ دەبێت
و ئێمە لە بەر بۆن و بەرامەی دەرد لە سەر خۆ دەچین.

زۆر جێگەی داخە کە ژنێك دەیتوانی شیعری ئاوا بڵێ، و زەینی بە ڕامان و سروشتەوە خەریك دەبوو، بە ناچاری ڕووی هێنابوە قین و پەژارە و ناهومێدی. بەدەم هێنانە بەر چاوی تانە و تەشەر لێدان و گاڵتە پێکردن، ماستاو چیەتی و دوودڵی شاعیرانی کارامەوە، لە خۆمم پرسی: «بەڵام چۆن دەیتوانی بەرخودان بکات؟ڕەنگە خۆی لە ژوورێکی دەرەوەی شاری بەند کردبێ تاوەکو بنووسێ، و لەوانەیە ناهومێدی و ئازاری دەروونی سنگی دادڕیبێ، هەر چەندە مێردەکەی لە دلۆڤانترین مێردەکان بووە و ژیانی هاوسەریەتیەکەشیان بێ عەیب. دەڵێم «لەوانەیە»، چونکە کاتێك خەریکی دیتنەوەی حەقیقەت دەبین سەبارەت بە لیدی وینچێلسی، وەك گشت جارێك تێدەگەین وا هیچ چەشنە زانیارییەك سەبارەت بەومان لەبەر دەستدا نییە. ئەو زۆر خەمۆکی بووە، و

خەمۆکیبوونەکەشی لانیکەم تا ڕادەیەك پاساوی هەیە، بە تایبەتی کاتێك، کە پێمان دەڵێ لە گێژاوی ئەم حاڵەدا، ئاوا بۆی چووە:

شیعرەکەم سوك بووە، و ئیشی من

لەبەر چاوی ئەوان ئیشێکی گەمژانە و بێ کەلکە یان هەڵەیەکی بێ چاوەڕووانەیە.

کارێك ئاوەها شەرمەزار کرابوو، هێندەی ئێمە دەزانین، کاری بێ زەڕی پیاسەکردن لە مەزرا و خەیاڵ پلاو بووە:

دەستی من پێی خۆشە بە دووی شتی نائاساییدا بگەڕێت
و دوور کەوێتەوە لە ڕێگە باو و ناسراوەکان
و لە ناو هاورێشمە کالەوە بووەکان،
گوڵە باخ چیتر بە چرپە هیچ ناچڕێ.

ئاساییە ئەگەر خووگرتن و دڵخۆشی و زەوقەکەی ئەو ئەمە بووە، نەدەکرا چاوەڕوانییەکی جگە لە گاڵتەپێکردنی هەبێ. دەڵێن پۆپ یاگێی"[١٠٦]" گاڵتەی پێدەکرد پێی دەگوت «ژنی ڕووناکبیر ئاسا» وا «هۆگریەکی زۆری بە ڕەش کردنەوە هەیە. هەروەها دەڵێن لیدی وینچیلسی بە گێی پێکەنیوە و دڵی هێشاندووە. بە قسەی خاتو وینچیلسی، تریویا"[١٠٧]"کەی گێی ئەوە نیشان دەدات کە «باشتر وا بوو ئەو قەرەوێلەی گەڕۆك بە دووی خۆیدا ڕاکێشێ تاوەك لە سەری دابنیشێ. بەڵام هەمو ئەمانە «دەنگۆکی گومان لێکراو»ن، و بەو جۆرەی ئاغای موری دەڵێ، «خەفەتهێنەر». بەڵام من لەمەیاندا لەگەڵ ئەو هاوڕا نیم لەبەر وەی پێم خۆش بوو تەنانەت ڕادەیەکی زۆر لەم دەنگۆکە گومان لێکراوانەم لە بەر دەستدا بووایە تا بمتوانیایە وێنەیەك لەم خاتونە خەمۆکە ببینمەوە یان ساز بکەم، ئەو خاتونەی وا عاشقی سووڕانەوە لە مەزراکان و بیرکردنەوە لە شتە نا ئاساییەکان بووە و ئاوا بە پەلە و نەشیاو «بەڕێوبەرایەتی شەکەت هێنی ماڵی کۆیلەتی»سووك دەکرد. بەڵام ئەو، بە قسەی ئاغای موری زۆر بڵە و چەنە درێژ بوو. مرخەکەی لە ناو گیا هەرزەکاندا گەشەی ساند و گیا کێویەکان دەوریان دا. توانابیە پەتی و لەبەر چاوەکەی هیچ هەلێکیان بۆ خۆ وەدەر خستن پێنەدرا. کەواتە، کتێبەکەیم خستەوە ناو قەفەسەکە، ڕووم کردە

---

106-John Gay
107-Trivia

خاتونێکی پایە بەرزی تر، دووشێسی ئەوەی وا لەمب"[108]"خۆشی دەویست، مارگرێت نیوکاسێل"[109]"، ئاژاوەگێڕ و سەرسوورهێنەر، بە تەمەنتر لەو بەڵام هاو سەردەمی ئەو. ئەم دوو ژنە زۆر جیاواز بوون، بەڵام خاڵی هاوبەشیان ئەوە بوو وا هەر دووك نەجیبزادە بوون، هیچیان منداڵیان نەبوو، و هەر دووکیان مێردیان بە پیاوی زۆر باش کردبوو. هەر بەو جۆرەی بە نیسبەتی شیعرەوە زەوق و شەوق لەهەر دووکیاندا داگیرساوە، هەر دووکیان بە هۆگەلێکی وەك یەك تووشی تەنگەژە و بەلارێداچوون بوون. کتێبی دووشێس کە هەڵدەنەوە، چاوتان هەر بە هەمان فیشقەکردنی رق و قین دەکەوێت.. «ژنان وەك کوند و شەمشەمە کوێرە دەژین، وەك ئاژەڵ کار دەکەن، وەکی کرم دەمرن....مارگرێتیش دەیتوانی ببێتە شاعیر لە سەر دەمی ئێمەدا، ئەم هەمووە بزاڤە دەیانتوانی بەردێك بخەنە سەر بەردێك. بەڵام لەو هەلومەرجەدا، چ شتێك دەیتوانی ئەو هۆشە ڕانەهێنراوە، تژی و پەشێوە لە بۆ کەڵك وەرگرتنی مرۆڤ لەغاو، و ماڵی کات و ڕای بهێنیێ؟ ئەو هۆشە تێکەڵ و پێکەڵە فیچقەی کرد و وەك سێلاوێکی سەروا و پەخشان و فەلسەفە لە ناو کتێبگەلی قەبارەی رەحێلی دا وا قەت کەس نایخۆێنێتەوە گیرساوە. ئەو دەبا میکرۆسکۆپێکی پێ بوایە. دەبوو فێر با، چاو لە هەسارەکان بکات و بەڵگەی زانستی بێنێتەوە. هۆشی ئەو لە تەنیایی و ئازادیدا بیچمی گرت. کەس لەغاوی نەکرد. کەس ڕای نەهێنا. مامۆستاکان مۆرەیان لێ کرد. لە کۆشکی شا گاڵتەیان پێکرد. سێر ئێگرتۆن بریجێز"[110]"سکاڵای لە بێ شەرمیەکەی دەکرد «وا لە ژنێکی نەجیب زادە ڕووی دەدا کە لە دەربار گەورە ببو. ئەو خۆی بە تاق و تەنیا لە وەلبەك"[111]" بەند کرد.

بە ڕاستی تێڕامان لە خاتو مارگرێت کاوێندیش"[112]"چ وێنەیەکی ڕوونمان لە تەنیایی و یاخیگەری وەبیر دەهێنێتەوە! دەڵێی چڵە هارۆیەکی یەکجار زۆر گەورە لە گشت باخچەکەدا ڕەگاژۆی کردووە و سێبەری خستوەتە سەر گشت گوڵە باخ و مێخەکەکان و فەوتاندوونی. چەندە جێگەی داخە، کە ژنێك کە بەڕای ئەو «باشترین ژنەکان ئەوانەن وا زەینیان زۆرتر ڕاهێنراوە» کاتی خۆی بە نووسینی تورەهات و ڕۆچوونی پتر لە نەزانی و تێنەگەیشتوویی بە فیڕۆ بدات تا بگاتە ئەو جێگەیە کاتێ لە کالیسکەکەی دێتە دەر، خەڵکی دەورەی دەدەن. وادیار بوو دووشێسی دێوانە

108-Charles Lamb
109-Margaret Newcastle
110-Sir Egerton Brydges
111-Welbeck
١١٢- Margaret Lucas Cavendish (١٦٢٣-١٦٧٣)دووشێس نیوکاسێل-و. ف

ببووە شەولەبان بۆ چاو ترسێنکردنی کچانی وریا و وشیار. لەم کاتەدا، هەر وا کە کتێبەکەی دۆشێسم دەخستەوە ناو قەفەسەکە و نامەکانی دوروتی ئازبورن"[١١٣]"م هەڵدەداوە، وەبیرم هاتەوە کە دوروتی لە نامەکەیدا بۆ تێمپل ئاماژە بە کتێبە نۆیەکەی دوشێس دەکات. «بە دڵنیاییەوە ژنەی بێچارە هەندێك خاتری پەرێشانە، دەنا قەت ئاوا قەشمەرە نەدەبوو، کە دەست بەرێ بۆ نووسینی کتێب، ئەویش کتێبی شیعر من تەنانەت ئەگەر شەو و ڕۆژێکیش نەنووم ئاوام بەسەردا نایە.

وە ئا بەم جۆرە، چونکە هیچ ژنێکی عاقڵ و نەجیب نەیدەتوانی کتێب بنووسێ، دوروتی کە هەستیار و خەمۆکی بوو، لە سۆنگەی هەڵس و کەوتەوە خاڵی بەرامبەری دوشێس بوو، و هیچی نەنووسی. نامەکان بە هیچ دانەدەنران. ژن دەیتوانی هەر بە دەم دانیشتنی لە پەنا جێگەی باوکی نەخۆشیەوە نامە بنووسێ. دەیتوانی لە پەنا ئاگری سۆپاکە، کاتێ پیاوان خەریکی قسان بوون، بێ وەی هێمنایەتیەکەیان تێکدات نامە بنووسێ. بەدەم چاو خشاندنم بە سەر نامەکانی دوروتی، بیرم لەوە کردەوە، سەیرە ئەو کچە بە تەنیا و بێ ئەوەی هیچ ڕاهێنانێکی دیبێ چ تواناییەکی سەیری لە سازکردنی ڕستە و دیمەنەکاندا هەبووە. چاو لێکەن چۆن ڕستەکان بە دووی یەکدا ڕیز دەکات:

«پاش خواردنی شیوی نیوەڕۆ دادەنیشین و قسە دەکەین تاوەك باسی ئاغای "ب" دێتە گۆڕێ و ئەو کاتە من دەڕۆم. ئەوپەڕی گەرمای ڕوژ بە خۆیندنەوە یان کارکردن تێدەپەڕێ و دەورووبەری کاتژمێر شەش یان حەوت دەچمە لەوەڕگەی گشتی وا نزیکە لە ماڵەوە و لەوێ چەند دانە کیژی گەنج مەڕ و مانگا دەلەوەڕێنن و لە بەر نیسێ دادەنیشن و گۆرانی دەڵێن بەرەو لایان دەچم و دەنگ و جوانییەکەیان لەگەڵ ژنانی کەونارا بەراورد دەکەم وا لە پەرتووکەکاندا شتم لەبارەوەیان خۆیندوەتەوە و جیاوازیەکی زۆری تێدا بەدی دەکەم، بەڵام قسەکەم قەبووڵ بکە، بە ڕای من ئەوانە هەر ئەوندە پاك و بێگەردن کە ئەوان دەیانتوانی بن. دەیاندووێنم و تێدەگەم هیچیان لە دڵخۆشترین خەڵکانی جیهان کەمتر نییە، مەگین پێزانین بەوەی ئاوان، زۆر جاران کە بە قسەوە سەرقاڵین، یەکێکیان چاو لە دەورووبەری دەکات و تێدەگات مانگاکەی چووەتە مەزرای گەنمە شامیەکە، پاشان هەمویان وا پێکەوە هەڵدێن دەڵێی باڵیان پێوەیە. من کە زۆر گورج و گۆڵ نیم وەدوا

---

١١٣- Dorothy Osborne(١٦٢٧-١٦٩٥). لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی وا دوروتی ئازبورن دەسگیرانی سێر ویلیام تێمپل بوو، یەکڕیز نامەی بۆ دەنووسی. ئەو جووتە پاشان، هەر چەندە بنەماڵەکانیان پێیان خۆش نەبوو، پێکەوە زەماوەندیان کرد. نامەکانی دوروتی، کە لە ساڵی ١٩١٤ بڵاو بوونەوە، بە هۆی شێواز و زمانەکەیانەوە کەوتنە بەر سەرنجی کەسانێکی زۆر. و. ف

دەکەوم، ئەو کاتەی دەبینم گاڕانەکەیان بەرەو ماڵ ڕادەدەن، لەبەر خۆمەوە دەڵێم کاتی ئەوە هاتووە منیش بچمەوە ماڵێ. پاش شێوی شەوێ، دەچمە باغی و لە پەنا ئەو ڕوبارە بچوکەی بە ناویدا تێدەپەڕێ دادەنیشم و ئاوات دەخوازم تۆم لە کن بووایەی....

دەکرا سۆیند بخۆی ئەو توانایی نووسەر بوونی هەیە. بەڵام«من تەنانەت ئەگەر شەو و ڕۆژێکیش نەنووم ئاوام بە سەردا نایا. -کاتێ دەبینین تەنانەت ژنێك، ئەویش ژنێك کە هۆگرە بە نووسین، بڕوای وایە کتێب نووسین قەشمەرەیە، و تەنانەت باسی خاتر پەرێشانی دەکات، دەکرێ پەی بە ڕادەی ئەو دژایەتیکردنە لەگەڵ نووسینی ژنان ببەیت. بە دەم خستنەوەی کتێبە تەسکەکەی نامەکانی دوروتی لە قەفەسەکە، لەبەر خۆمەوە گوتم، بەمجۆرە دەگەینە خانمی بێن.

لەگەڵ خانمی بێن دەگەینە خولێکی گرینگی ڕێگەکە. ئەو ژنە گەورانەی وا گۆشەگیر و تەنیا لە باخەکان لە نێو کتێبە قەبارە رەحێلیەکاندا بەند کراون، بێ بەردەنگ یان ڕەخنە و تاقە لەبەر دڵی خۆیان نووسیویانە، بە جێ دەهێڵێن. و دێینە شاری و لەگەڵ خەڵکانی ئاسایی ناو کۆڵان و بازار پێوەندی دەگرین. خانمی بێن ژنێك بوو لە چینی ناوەندی خاوەنی گشت تایبەتمەندیە ئاسایەکانی وەك جەفەنگ بازی، بەدەماخی و ئازایەتی ژنێك وا بە هۆی مردنی مێردەکەی و چەند بەسەرهاتێکی ناخۆشی پێوەندیدار بە خۆیەوە ناچار بوو بۆ تێپەڕاندنی ژیان پاڵ بدات بە پاڵی هۆش و زیرەکی خۆیەوە. ئەو ناچار بوو لە دۆخێکی یەکسانی پیاواندا ئیش بکاتن. لە چاو هەوڵە زۆر و تەقەلای بێ وچانەکەی، داهاتەکەی هەر بە قەرا خەرجەکانی بوو. بایەخی ئەم شتە لە ڕاستیدا زۆرترە لە هەموو ئەو شتانەی وا دەینووسی تەنانەت لە پارچە شیعرە مەزنەکەی « من هەزاران شەهیدم دروست کردووە»"[١١٤]"یان «ئەوین لە جێگەی سەرکەوتوییدا چەندە باش گرینگترە. چونکە لێراوەیە ئازادی زەین دەست پێدەکات یان، بە واتایەکی باشتر، ئەم هەلە دەڕەخسێ وا زەین بە درێژایی زەمان ئازاد بێ تاوەك ئەو شتەی پێی خۆشە بینووسێ. چونکە ئێستەکە کە ئافرا بێن"[١١٦]"ئەو کارەی کردبوو، کچان دەیانتوانی بچنە لای دایك و بابیان و بڵێن، نایەهوێت مانگانەم بدەنێ، من دەتوانم لە ڕێگەی نووسینەوە پارە دەربێنم. هەڵبەت وڵامی ئەم قسەیە تا ساڵانێکی زۆر ئەوە بوو کە بەڵێ، بە مەرجێ وەك ئافرا بێن بژیت! مردن باشترە لەو ژیانە! و دەرکەکە تەق پێوە دەدرا. لێرەدا، ئەو بابەتە زۆر سەرنجڕاکێش دێتە گۆڕێ، یانی ئەو

114- ‘‘A Thousand Martyrs I Have Made’’
115- ‘‘Love in Fantastic triumph Sat’’
116- Aphra Behn

گرینگایەتیەی وا پیاوان بە داوێن پاکی ژنانیان دەدا، و کاریگەرییەکەی لە سەر فێرکردن و پەروەردەکردنی ژنان ئەگەر خۆیندکارێك لە نیوهام یان گەرتن پێی خۆش بێ خەریکی ئەو بابەتە بێ، لەوانەیە کتێبێکی باشی لێ دەربێت. ڕەنگە بکرێ بۆ وێنەی سەرەتای کتێبەکە کەڵك لە وێنەی لیدی دادلی"[١١٧]"وەرگری وا بەو ئاڵماسانەی بە خۆیەوە هەڵواسیون لە ناو کۆمەڵە مێشوولەیەکی گەسکجاڕێکی سکۆتلەند دانیشتووە. ڕۆژنامەی تایمز چەند ڕۆژ دواتر هەواڵی مردنی لیدی دادلی نووسی، لۆرد دادلی «پیاوێك بوو بە زەوقێکی ڕاهێنراو و زۆر سەرکەوتوو بوو، خێرومەند و دڵئاوا، بەڵام بە شێوازێکی زۆر سەیر زۆردار. ئەو جەختی لە سەر ئەوە دەکرد، کە هاوسەرەکەی دەبێ لە کۆخێکی ڕاوی زۆر دوورکەفتە لە هایلەندز"[١١٨]"، جلی زۆر فەرمی لەبەر کات، ئەوی لە ناو زێر و زەمبەرێکی زۆر جواندا نوقم کردبوو. وە شتی تر و شتی تر، «هەموو شتێکی بەو دەدا- و قەتیش چاوەڕوانی هیچ بەرپرسایەتیەکی لێ نەبوو. وە پاشان لۆرد دادلی جەڵتە لێی دا و ژنەکەی ناچار خەریکی پەرستاری لێکردنی بوو و لەمە بەدواوە ملکەکانی وی بە توانایی و شیاویەکی زۆرەوە بەڕێوە دەبرد. ئەو زۆرداریە سەیرە، لە سەدەی نۆزدەیەمیشدا هەبوو.

بەڵام بگەڕێینەوە سەر بابەتە سەرەکیەکە. ئافرا بێن سەلماندی، کە دەکرێ بە نووسین پارە دەربێنی، ڕەنگە لە هەمبەر قوربانیکردنی تایبەتمەندیە باشەکان بێ و کەواتە ئیتر وردە وردە نووسین هەر هێمای حۆلی و شێتی نەبوو، بەڵکو لە کردەوەدا گرنگی پێدرا. لەوانە بوو مێردێك بمرێ، یان کارەساتێك بە سەر بنەماڵەدا بقەومێ. لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا، بە سەدان ژن لە ڕێگەی وەرگێڕان یان نووسینی ڕادەیەکی بێ ئەژمار ڕۆمانی خەراپ، وا تەنانەت ئیتر نێویان لە کتێبە دەرسیەکانیشدا نەماوە و دەکرێ لە شەقامی چەرینگ کڕاس"[١١٩]"لە ناو قوتوی کتێبە چوار پەنسیەکاندا بیانبینییەوە خەریکی داهات دەرهێنان بوون تا وەك بیخەنە سەر بژیوی خۆیان یان بنەماڵەکانیان ڕزگار کەن. بزووتنەوەی توندوتۆڵی زەینی ژنان لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا وتوێژ، کۆبوونەوە، نووسینی گوتار سەبارەت بە شێکسپیر، وەرگێڕانی بەرهەمە کلاسیکەکان- لەسەر ئەم ڕاستیە دامەزراوە وا ژنان دەیانتوانی بە نووسین داهات بەدەست بێنن. پووڵ بایەخ و گرنگی دەدات بە هەر شتێکی وا لەبەر بەلاشی بە ڕووکەشی و هیچ دادەندرێ. گاڵتەکردن بە «بەو ژنانەی پێیان وایە رووناکبیرن و زۆریان دڵ بە ڕەشکردنەوەی لاپەڕەکانەوەیە» ئێستەکەش هەر

---

117- Lady Dudley
118- Highlands
119-Charring Cross Road

لەوانە بوو ببێ، بەڵام ئیتر نەدەکرا حاشا لەوە بکەی وا ئەوان دەیانتوانی پارەیەك بهاونە ناو جانتاکانیانەوە. لەو سۆنگەیەوە، لە ساڵەکانی دوایی سەدەی هەژدەیەمدا گۆڕانکاریەك ڕووی دا، کە ئەگەر بە هیوای سەر لە نۆی نووسینەوەی مێژوو بوایەم، زیاتر وەسفی ئەوم دەکرد و بایەخێکی پترم پێدەدا تاوەك شەڕە خاچیەکان یان شەڕەکانی ڕۆز.

ژنی چینی ناوەندی نووسینی دەست پێکرد. ئەگەر بەدەماری و دەمارگرژی بایەخێکی هەیە، و ئەگەر میدێل مارچ و ویلت و بەرزاییە باگرەکان گرنگایەتیان پێدەدرێ، کە واتە ئەم بابەتە وا ژن بە شێوەیەکی گشتی —نەك هەر ژنی نەجیبزادە و گۆشەگیر و بەندکراو لە ماڵێکی دەرەوەی شاری، لە نێو کتێبە قەبارە رەحێلی و زمان لووسەکانیدا-ڕووی کردە نووسین گرینگترە لەوەی کە من بتوانم بە کاتژمێرێك قسە لەسەرکردن بیسەلمێنم. بێ ئەم کۆنەکارانە جین ئاستەن و خوشکانی برۆنتێ و جۆرج ئیلیۆت هەر ئەوندە دەیانتوانی بنووسن وا شێکسپیر بێ مارلۆ دەیتوانی بنووسێت، یان مارلۆ بێ چاسێر، یان چاسێر بێ ئەو شاعیرە لەبیرەوە چووانەی وا ڕێگەیان خۆش کرد و بەسەر دڕەندەیی زماندا زاڵ بوون. چون شاکارەکان تاق و تەنێ لە دایك نابن ئاکامی ساڵەها ڕامانی گشتی و تێفکرینی بە کۆمەڵی خەڵکە کەواتە ئەزموونی کۆمەڵی خەڵك پشتیوانی دەنگێکی تاکە. جین ئاستەن دەبوو تاجە گوڵینەیەکی لە سەر گۆڕی فێنی بۆرنی دابنایەت، و جۆرج ئیلیۆت دەبوو ڕێزی لە تاپۆی خۆڕاگری ئێلیزا کارتێر"[120]" بگرتایە هەمان پیرێژنە ئازاکەی وا زەنگوڵەیەکی بە قەرەوێڵەکەی خۆیە دەبەست تا بەیانی زوو هەستێ و فێری زمانی یونانی ببێ. گشت ژنان دەبێ بە یەکەوە قەبری ئافرا بێن گوڵباران بکەن وا لەوپەڕی ناوزڕاندا بەڵام بە شایانی لە وێستمینیستەر ئەبی"[121]"خەوتووە. چونکە ئەو بوو وا مافی بەیانی ئەندێشەی بۆ ژنان وەرگرت. لەبەر ئەوە-لەبەر ئەم ژنە گومان لێکراو و سەودا سەرە- کە قسەکەی من ئەوشۆکە زۆر وەك خەون و خولیا ناچێ: «بە پاڵپشتی عەقڵ و هۆشی خۆتان ساڵی پێنسەد پاوەندتان داهات هەبێ.

ئێستەکە دەگەینە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم. لەم کاتەدا، بۆ یەکەم جار چەند قەفەسەم دییەوە وا بە شێوەیەکی گشتی بۆ بەرهەمەکانی ژنان تەرخان کرابوو. بەدەم چاو لەوان کردنەوە، بێ ئیختیار لە خۆمم پرسی، بەڵام بۆچی گشتی ئەم کتێبانە جگە لە هەندێکی کەمیان، ڕۆمانن؟ هۆگرایەتی سەرەکی بە شیعر بوو. «پایەبەرزترین مەقامی شیعر» هی خانمە شاعیرێك بوو. هەم لە فەڕانسە و هەم لە ئینگلیستان ژنانی شاعیر لە ژنانی ڕۆماننووس لە پێشترن. جگە لەمە بەدەم

120-Elisa Carter
121-Westminster Abby

چاولێکردنم لەو چوار ناوە بەناوبانگەوە، لە خۆمم پرسی، جۆرج ئیلیۆت چ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ ئیمیلی برۆنتێ هەیە؟ مەگە شارلۆت برۆنتێ نەبوو هیچ شتێك لە جین ئاستەن تێندەگەیشت؟ لەوانەیە، جگە لەو ڕاستەقینە گرینگەی ئەم چوارە هیچیان منداڵیان نەبوو، مەحاڵ بوو چوار کەسایەتی نالەبارتر لەم چوار ژنە لە ژوورێکدا بە یەکتری بگەن-تا ئەوندەی کە مرۆڤ هەوای سازدانی دیتنێك و وتووێژێکی خەیاڵی لە نێوانیاندا لە کەللەی بدات. بەم حاڵەشەوە، هێزێکی سەیر وای لە هەموویان دەکرد، کە کاتێك قەڵەمیان لە سەر قاقەز دادەنا، ڕۆمان بنووسن. لە خۆمم پرسی ئایا ئەم بابەتە پێوەندیەکی بە لە دایك بوون لە ناو چینێکی ناوەندی دا هەبوو و لەگەڵ ئەم ڕاستەقینەیە - ڕاستەقینەیەك وا بڕیار بوو خاتوو ئیمیلی دەیویس"[١٢٢]"نەختێك دواتر بە شێوەیەکی سەرسووڕ هێنەر بیسەلمێنێ وا بنەماڵەی ناوەندی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا تاقە ژوورێکی دانیشتنیان بۆ ئەندامانی خۆیان هەبوو؟ ئەگەر ژنێك بینووسیایە دەبوو لە ژووری دانیشتنی گشتی بینووسیایە. هەر بەو جۆرەی خاتو نایتینگێل دواتر بە توندی لێی وەزاڵە هات « ژنان هەرگیز نیو کات ژمێریشیان کات نییە، کە بۆ خۆیانی دابنێن» - هەردەم موزاحیمی کارەکەی دەبوون. لەبەر ئەم شتانە، نووسینی پەخشان و چیرۆك ئاسانتر بوو تاوەك هۆنینەوەی هۆنراوە یان نووسینی شانۆنامە، لەبەر وەی کۆ کردنەوەیەکی زەینی کەمتری دەویست. جین ئاستەن تاوەك دوواین ڕۆژەکانی تەمەنی هەر بەو جۆرە دەینووسی. برازاکەی لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ: «زۆر سەیرە چۆن دەیتوانی گشت ئەم کارانە بکات، لەبەر وەی ژوورێکی کاری بە جیای نەبوو کە خۆی تێ بخزێنێ، و زۆربەی کارەکەی دەبوو لە نێو ژووری دانیشتنی گشتی، بە هەموو جۆرە موزاحیمەتێکی چاوەڕواننەکراوەوە بکردایە، وریا بوو خزمەتکارەکان یان میوانەکان یان هیچ کەسێکی تر جگە لە ئەندامانی بنەماڵەکەی بەوە نەزانن خەریکی نووسینە.»"[١٢٣]"جین ئاستەن دەسنووسەکانی دەشاردەوە یان بە قاقەز وشك کەرەوە دایدەپۆشی. لە لایەکی ترەوە، تاقە ڕاهێنانێکی ئەدەبی ژنێك لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا دیتنی کەسایەتی و لێکدانەوەی ئێحساسات بوو. هەستیاریەکەی چەندەها سەدە لە ڕووی کاریگەرییەکانی ژووری دانیشتنی گشتیەوە ڕاهێنرابوو. هەستگەلی خەڵکی کاریگەریی لەسەر دانابوو پێوەندیەکانی تاکەکان هەردەم لەبەر چاوی بوو. کەواتە، کاتێك کە ژنی چینی ناوەندی

---

١٢٢- Emily Davies (١٩٢١-١٨٣٠١٨٣٠)، لە چالاك وانانی فێمینیست و بناغە دانەرانی کۆلێژی کچانەی گەرتن لە کەمبریج. و.ف

123-Memoir Of Jane Austen, by James Edward Austen-Leigh

خەریکی نووسین بوو، ئاساییە ڕۆمانی نووسی، هەر چەندە، بەو جۆرەی بە تەواوی ڕوونە، لەو چوار ژنەی لێرادا نێومان هێنان دوانیان هەر لە خۆیاندا ڕۆماننووس نەبوون. ئێمیلی برۆنتێ دەبوو شانۆنامەی هەڵبەستراوی بنووسیبایە و زەینی بە هێزی جۆرج ئیلیۆت، ئەو کاتەی گڕی داهێنانەکەی کوژابووە، دەبوو پاشماوەی هێزەکەی خۆی بۆ نووسینی مێژو و ژیاننامە دابنابایە. بەڵام ئەوان ڕۆمانیان نووسی بەدەم ئەوەی، کە دەستم دەدا فیس و دەمارگرژی لە ناو قەفەسەکە، لەبەر خۆمەوە گوتم، تەنانەت دەکرێ هەنگاوێك زیاتر هەڵبێنییەوە و بڵێی ڕۆمانی باشیان نووسی. بێ زێدەڕۆیی کردن، یان زامدارکردنی غووروری ڕەگەزی بەرامبەر، دەکرێ بڵێی بە دەماری و دەمارگرژی کتێبێکی باشە. هەر چۆنێك بێ، تریق بوونەوەی ناوێ ئەگەر لەکاتی نووسینی بەدەماری و دەمارگرژیدا تووشی سەر لێشێوان بووایەی. بەڵام جین ئاستەن دڵخۆش بوو بەوە، کە لاولاوەی دەرکەکە جیڕە جیڕی دەهات و ئەو دەیتوانی بەر لەوەی کە کەسێك بێتە ژوور دەسنووسەکەی خۆی بشارێتەوە. بە ڕای جین ئاستەن، نووسینی بەدەماری و دەمارگرژی کارێکی شەرمهێن بوو. لە خۆمم پرسی، ئەگەر جین ئاستەن بە پێویستی نەزانیایە دەسنووسەکەی خۆی لە میوانەکان بشارێتەوە، ئایا بەدەماری و دەمارگرژی دەبووە ڕۆمانێکی باشتر؟ یەك دوو لاپەڕەم لێ خۆێندەوە تا بەو شتە بزانم بەڵام بچووکترین نیشانەیەکم لەوەی کە بارودۆخی کارەکەی بەرهەمەکەی تووشی کەموکووڕی کردبێ نەدیتەوە. ئەم شتە پێموا گرنگترین مۆعجیزەی فیس و دەمارگرژیە. ئەم ژنە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٠ بێ نفرەت، بێ پەژارە، بێ ترس، بێ دەنگ هەڵبڕین، بێ مەوعیزە کردن دەینووسی. چاوێکم لە کتێبی ئانتۆنی و کلیۆپاترا کرد و بیرم کردەوە شێکسپیریش ئاوای دەنووسی کاتێ خەڵکی شێکسپیر و جین ئاستەن پێکەوە هەڵدەسەنگێنن ڕەنگە مەبەستیان ئەوە بێ زەینی هەر دووکیان گشت لەمپەرەکانی لەسەر ڕێ لابردووە هەر بۆیە ئێمە نە جین ئاستەن دەناسین و نە شێکسپیر هەر بۆیە جین ئاستەنیش وەك شێکسپیر، دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەر وشەیەکیدا کە دەینووسێ. و ئەگەر بارودۆخ بە هەر چەشنێ زیانێکی گەیاندبێ بە جین ئاستەن، ئەم زیانگەیاندنە لەو ژیانە کەم‌وکووڕەدا بووە وا بە سەریدا داسەپا بوو. ژنێك قەت نەیدەتوانی بەتەنێ بڕواتە دەرێ. ئەو قەت سەفەر نەچوو هەرگیز بە پاس بە شاری لەندەندا نەگەڕا یان بە تەنیا لە خوارنگەیەك نانی نەخوارد. بەڵام ڕەنگە ئەوە سروشتی جین ئاستەن بووبێ وا قەت ئەو شتەی نەیەوێت وا نییەتی. لێهاتوویەکەی و بارودۆخەکەی تەواو پێکەوە دەسازان. بەڵام کاتێ جین ئەیرم هەڵداوە و لە پەنا بەدەماری و دەمارگرژیم دانا، لەبەر خۆمەوە گوتم، بە گومانم لەوەی کە ئەم بابەتە سەبارەت بە شارلۆت برۆنتەش هەروا بێت.

بەشی دوازدەهەمی کتێبەکەم هەڵداوەو چاوم کەوت بەم دەستە واژەیە: «هەر کەسێ پێی خۆش بێ دەتوانێ لۆمەم بکات. لە خۆمم پرسی، بۆ چی شارلۆت برۆنتێیان لۆمە دەکرد؟ و خۆیندمەوە وا جین ئەیر بەوە خووی گرتبوو هەر کات خانمی فیرفەکس"[١٢٤]"مرەببای ساز دەکرد، بچێتە سەر بان و لەو سەرەوە چاو لە مەزرا دوورە دەستەکان بکات. پاشان هیوای دەخواست —و هەر بۆیە لۆمەیان دەکرد-کە: «ئەو کاتە هیوام دەخواست هێزێکی دیتنی وام هەبوایە کە بیتوانیایە لەو کەوشەنە پتر بڕ بکات و بیتوانیایە بگاتە دونیای پڕ جم و جۆڵ، شارەکان، و ناوچەکانی تژی لە ژیان وا تاریفەکەیانم بیستبوو بەڵام قەتم نەدیبوون ئەو کاتە بوو وا ئارەزووم دەکرد ئەزموونێکی زیاترم هەبوایە لەگەڵ هاونەوعەکانی خۆم زیاتر هەڵس‌وکەوتم بکردایە، و لەگەڵ ئەو کەسایەتیە جۆراو جۆرانەی وا لێرا دەستم پێیان ڕانەدەگەیشت ناسیاویم هەبوایە. بایەخم دادەنا بۆ چاکەکانی خانمی فیرفەکس و ئادێل، بەڵام بڕوام بە هەبوونی چاکەی بەگورتر بوو، و بە ئاواتەوە بووم ئەو شتە بیبینم وا بڕوام پێی هەیە.

«کێ بە گژم دا دێت؟ بێ گومان زۆر کەس، و پێم دەڵێن ناڕازییە. بە دەست خۆم نەبوو ئۆقرە نەگرتن لە سروشتم دا بوو و جار جارێك وەك ژان ئازاری دەدام....

«ئەم وتەیە قۆڕە، کە مرۆڤەکان دەبێ بە ئاشتی و هێمنایەتی قایل بن. مرۆڤەکان دەبێ بزووتنەوەیان هەبێ و ئەگەر هەلی بزووتنەوەیان بۆ نەرەخسێ، پێکی دێنن. بە میلیۆنان کەس تووشی چارەنووسێکی ڕەشتر و بێ جم و جووڵتر لە چارەنووسی من بوون و میلیۆنان کەس لە بێدەنگیدا یاخین دژ بە چارەنووسکەی خۆیان. کەس نازانێ لە نێو کۆمەڵی خەڵکانی دانیشتووی سەر زەوی چەند دانە یاخی بوون خەریکی سەر هەڵدانە. وای دابنێین ژنان بە گشتی ئارامن، بەڵام ئێحساسی ژنانیش ڕێك وەك ئێحساسی پیاوان وایە ڕێك وەك براکانیان بۆ ڕاهێنانی هێزەکانی خۆیان پێویستیان بە مەشقکردن هەیە و بۆ هەوڵ دانەکانیان گۆڕەپانیان دەوێت کەندو کۆسپی زۆر، ڕاوەستانی بێ سنوور، ڕێك وەك پیاوان ئازاریان دەدات و مێشك ویشکیە ئەگەر هاو نەوعانی بەختەوەرتر و لەسەرتری ئەوان بڵێن کە ژنان دەبێ خۆیان بە سازکردنی پودینگ و گۆرەوی چنین و پیانۆژەنین و گوڵ لێدانەوە ببەستنەوە. شەرمەزارکردن و گاڵتەپێکردن بەو ژنانەی وا دەیانهەوێت پتر فێر بن و بکەن لەو شتەی داب و نەریت بۆ ڕەگەزی ئەوانی بە ڕەوا دەزانێ، مێشك ویشکیە.

124-Fairfax

«کاتێ کە ئاوا بە تەنیا بووم، زۆر جار گوێم لە پێکەنینی گریس پوو ل"[١٢٥]"دەبوو...»

لەبەر خۆمەوە گوتم ئەم وێستانە هی باش نەزانینە. ئاوەها بەبێ پێشەکی تووشی گریس پوول هاتن ناخۆشە. یەکپارچەیی و ڕێك و پێکی بەرهەمەکە تێك دەچێت. کتێبەکەم لە پەنا بەدەماری و دەمارگرژی م دانا و بیرم لەوە کردەوە دەکرێ بڵێی ژنێك وا ئەم لاپەڕانەی نووسیوە لێهاتوویەکی پتر بووە لە جین ئاستەن بەڵام ئەگەر دیسان بیانخوێنینەوە و سەرنج بدەینە شێواویەکەیان و ئەو وەستانە لەکوت و پڕانەیان لەوە دەگەین وا ئەو قەت ناتوانێ مرخەکەی خۆی بەگشتی بخاتە ڕوو. کتێبەکانی عەیبدار و دەستێوەردراو دەبن. لەو جێگەیەی کە دەبێ هێمن بێ، بە ڕقەوە دەنووسێ. لەو شوێنەی، کە دەبێ ئاوەزمەندانە بنووسێ، گەمژانە دەنووسێ. لەوێ وا دەبێ باسی کەسایەتیەکانی چیرۆکەکەی بکات، باسی خۆی دەکات. ئەو لەگەڵ چارەنووسی خۆی شەڕ دەکات. مەگین دەکرا بە لاوی و داڕماوی و ملکەچی نەمرێ؟

لانیکەم دەکرا بۆ ساتێکیش بێ بیر لەوە بکەیەوە، کە چی دەبوو ئەگەر شارلۆت برۆنتێ بۆ وێنە ساڵی سێسەد پاوەندی ببوایە- بەڵام ئەم ژنە حۆلە مافی تایبەتی ڕۆمانەکانی خۆی یەکجێ بە ١٥٠٠ پاوەند فرۆشت- چی دەبوو ئەگەر بە چەشنێ زانیارییەکی زۆرتری سەبارەت بە دونیای پڕ لە جمەجۆڵ و شارەکان و ناوچەکانی تژی لە ژیان وەدەست بکەوتایە ئەگەر ئەزموونێکی پراکتیکی زۆرتری هەبوایە و زیاتر لەگەڵ هاونەوعەکانی خۆی هەڵسوکەوتی هەبوایە و کەسایەتیگەلێکی جۆراوجۆری بناسیبایە. ئەو لەم ڕستانەدا نەك هەر ڕێك پەنجە لە سەر عەیبەکانی خۆی دادەنێ، بەڵکو ئاماژە بە کەموکووڕیەکانی هاوڕەگەزەکانی خۆی لەو سەردەمەدا دەکات. کەس باشتر لە خۆی نەیدەزانی مرخەکەی تا چ ڕادەیەك گەشەی دەساند ئەگەر هەر بە وێنە تاقانەکانی مەزرا دوورکەوتوەکان تەرخان نەکرایە ئەگەر هەلی ئەزموونکردن و هاتوچۆکردن و سەفەرچوونی بۆ بڕەخسیایە. بەڵام شتێکی وا بۆ ئەو نەلوا درێخی لێ کرابوو و دەبێ دان بەو ڕاستیەدا بنێین، کە وا گشت ئەو ڕۆمانە باشانە — ویلێت، ئێما، بەرزاییە باگرەکان، وودرینگ هایتز، میدێل مارچ ژنانێك نووسیویانە وا ئەزموونەکەیان لە ژیان بەسترابووەوە بە ئەزموونی ژیان لە ماڵی قەشەیەکی بەڕێزدا. ئەم ڕۆمانانە لە ژووری دانیشتنی گشتی ئەو ماڵە ماقووڵانە و بە قەڵەمی ژنانێك

---

١٢٥- Grace Poole، لە کەسایەتیەکانی کتێبی جین ئەیر بەرهەمی شارلۆت برۆنتێ. گریس پوول خزمەتکارێکە وا جین بە هەڵە پێی وایە هەمان ژنە شێتەکەیە، لە کاتێکدا ئەو ئاگای لە ژنە شێتەکەی ڕاچێستێر دەبێ. و. ف

نووسراوه كه هێنده هەژار بوون وا هەر جارەو دەیانتوانی یەك دوو بەستەیٔ قاقەزی بیست و پێنج لاپەڕەیی بکرن بۆ وەی بەرزاییە باگرەکان یان جین ئەیری تێدا بنووسن. ڕاستە وا یەکێکیان -جۆرج ئیلیۆت-لە پاش خۆڕاگرتنی لە بەر تەنگەژەی زۆردا توانی ڕابکات، بەڵام ئەویش بە تاق و تەنیٚ هانای بردە بەر خانوویەکی هاوینە هەواری دوورەوە کەوتوو لە سەت جانز وود"[١٢٦]". و لەویٚ، لە ژێر سێبەری تاریکی دژایەتیکردنی دونیا، گیرساوە. جۆرج ئیلیۆت نووسی: «پێمخۆشە هەموان بزانن کە قەت داوا لە کەسێك ناکەم بێتە لام، مەگین ئەو بۆ خۆی داوایەکی وای لە من کردبیٚ.

مەگین ئەو نەبوو بە تاوانباری دەژیا و لەگەڵ پیاوێکی ژندار دەژیا، مەگین وا نەبوو کە لەوانە بوو خەوش بکەوێتەوە ناو داوێن پاکی خاتو ئیسمیت، یان هەر کەسێکی تر کە ڕەنگە سەرێکی لێبدایە؟ دەبیٚ چۆك دادەی بۆ داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، و «دەبیٚ لەو شتەی پێیدەڵێین دونیا دابڕی. لە هەمان کاتدا، لە لایەکی تری ئەوروپا، پیاوێکی گەنج بە ئازادی لەگەڵ ژنە قەرەجێك یان ژنێکی پایە بەرز دەژیا دەچووە شەڕ گشت ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤ، کە دواتر لە کاتی نووسینی کتێبدا زۆر بە کەلکی دەهات، بیٚ لەمپەر و سانسۆر لەبەر دەستیدا بوون. بیرم کردەوە ئەگەر تۆلستوی لە پرایری"[١٢٧]" لەگەڵ ژنێکی مێرددار بە تەنیا بژیایە و «لەو شتەی پێی دەڵێین دونیا» دایبڕیایە، هەر چەندێکیش وانەی ئەخلاقی و فێرکارانەی پیٚ ببڕاییٚ، ئەستەم بوو بتوانیٚ شەڕ و ئاشتی بنووسیٚ.

بەڵام ڕەنگە بکریٚ کەمێك قووڵتر لەمەڕ ڕۆماننووسین و کاریگەری جینسیەت لە سەر ڕۆماننووس لێبکۆڵدرێتەوە. ئەگەر چاوی خۆمان بقوچێنین و بیر لە ڕۆمان بە شێوەیەکی گشتی بکەینەوە، لەوە دەچیٚ ئافراندنێك بیٚ کە سەیر لە ژیان دەچیٚ، هەڵبەت بە ئاسانکاری و دەستێوەردانێکی بیٚ هەژمارەوە. هەر چۆنێك بیٚ، پێکهاتەیەکە وا وێنەیەك دەخاتەوە یاد، کە جارێك لە چوار سووچێك دەچیٚ، و جارێك لە پەرسگەی چینییەکان دەچێت، جاروبار میچ و سووچی هەیە و جارێك وەك کەلیسەی ئەیاسۆفیە لە قوستەنتەنییە قایم و پتەوە و لە گومەزی دەچێت. وەبیر چەند ڕۆمانی بەناوبانگ کەوتمەوەو بیرم کردەوە ئەم وێنەیە هەستێك لە مرۆڤا دەورووژێنیٚ، کە لەگەڵی گونجاوە. کەچی ئەو هەستە خێرایەکی لەگەڵ هەستەکانی دیکە تێکەڵ دەبیٚ، چونکە ئەم «وێنەیە» لە پێوەندی بەردێك لەگەڵ بەردێکی دی چیٚ نەکراوە، بەڵکو بەرهەمی پێوەندی مرۆڤێکە لەگەڵ مرۆڤێکی تر. ئا بەمجۆرە، ڕۆمان هەر چەشنە هەستگەلێکی ناتەبا و دژبەیەك لە ئێمەدا دەورووژێنیٚ.

---

126- Wood St. Johns
127- Priory

ژیان لەگەڵ شتێك جیاوازی دەبێت کە ژیان نییە. گرفتی گەیشتن بە هەر چەشنە پێکهاتنێك سەبارەت بە ڕۆمان، و دەسەڵاتی زۆری دەمار گرژیە تاکە کەسیەکان بەسەرمانەوە، لێرەوە سەرچاوە دەگرێ. لە لایەکەوە، پێمان وایە «تۆ» واتە جان"[١٢٨]"، قارەمانی ڕۆمان-دەبێ زیندوو بمێنییەوە، دەنا «من» لە گێژاوی ناهومێدیدا نوقم دەبم. لە لایەکی ترەوە، هەست دەکەین، مەخابن، جان، تۆ دەبێ بمری، لەبەر وەی پێکهاتەی کتێبەکە ئەوەی دەوێ. ژیان لەگەڵ شتێك جیاوازی دەبێت، کە ژیان نییە. کەواتە، چونکە کەم تا کورتێك ژیانە، وەك ژیان هەڵێدەسەنگێنین. دەڵێین جەیمز لەو مرۆڤانەیە وا زۆرم قین لێیانە. یان دەڵێین، هەموو ئەم قسانە قۆڕن. من بۆخۆم قەت ناتوانم هەستێکی ئاوەهام هەبێت. بیر لە هەر ڕۆمانێکی بەناوبانگ بکەینەوە، تەواو دیارە وا گشت پێکهاتەکە زۆر پێچەڵاوپێچە، چونکە لە ڕادەیەکی یەکجار زۆر دادوەریکردنی جیاواز و هەستگەلێکی جیاواز ساز بووە. سەیرە کتێبێکی کە ئاوا کۆ دەکرێتەوە، پتر لە یەك دوو ساڵان بەرگە بگرێت، یان ڕەنگە بۆ خۆینەرێکی ئینگلیسی هەر هەمان واتای بێ کە بۆ خۆینەری رووسی یان چینی هەیەتی، بەڵام ئەم کتێبانە جار جار بە شێوەیەکی زۆر سەیر بەرگە دەگرن. و ئەو شتەی لەم کاتە دەگمەنانەدا دەبێتە هۆی بەرگە هێنانیان (خەریك بوو بیرم لە شەر و ئاشتی دەکردەوە.) شتێکە کە پێی دەڵێین ڕاستگۆیی، هەر چەندە هیچ پێوەندیەکی بە دانی وەسڵەی حیسابەکە لە کاتی خۆیدا یا ئاکارێکی شەرافەتمەندانەوە لە کاتی بە پەلەیی و ناچاریدا نییە. مەبەستی مە لە ڕاستگۆیی سەبارەت بە ڕۆماننووس ئەوەیە، کە ڕازیمان دەکا بەوەی کە ئەو شتەی دەینووسێ حەقیقەتی هەیە. هەست ئەکەین، بەڵێ، قەت پێمان وا نەبوو شتێکی ئاوا، ڕاستەقینە بێت هەرگیز کەسانێکی وامان نەدەناسی ئاوا بجووڵێنەوە، بەڵام تۆ منت ڕازی کرد وایە، وا شتی ئاوا هەڵدەکەوێ. بە خۆیندنەوەی هەر لاپەڕەیەك و هەر دەستە واژەیەك، شتێك ڕوون دەبێتەوە چونکە لەوە دەچێ کە سروشت، لە ئەو پەڕی سەرسووڕ ماویدا، ڕووناکایەکی لە ناخی ئێمەدا داناوە تا لەبەر تیشکەکەیدا سەبارەت بە ڕاستگۆیی یان ناڕاستگۆیی ڕۆماننووس دادوەری بکەین. یان ڕەنگە سروشت، لە ناماقووڵترین دۆخی خۆیدا، چەشنە پێش زانیاریەکی بە جەوهەری نادیار لە سەر دیوارەکانی زەین هەڵکۆڵیوە کە ئەو هونەرمەندە گەورانە پەسەندی دەکەن، و هەر ئەوندەی دەوێ ئەم وێنەیە لەبەر ئاوری لێهاتوویدا ڕابگرین تا وەدیار کەوێت. ئەو کاتەی ئەم وێنە نادیارە ئاوا وەدیار دەکەوێت، و لەبەر چاوەکانی ئێمەدا دەبووژێتەوە، بە کەیف و سەرسووڕمانەوە دەڵێین: «ئەمە ڕێك هەر ئەو شتەیە وا هەموو کات هەستم دەکرد و دەمزانی و ئاواتیم دەخواست! و هەیەجانێکی زۆر

---

128- John

دەمانگرێ و کتێبەکە تەنانەت بە جۆرە ڕێز لێنان و بارەقەڵڵاییەکەوە، وەك بڵێی شتێکی زۆر بە نرخ بێت، دادەینەوە-وەك بڵێی پەناگایەکە وا تا ئەو کاتەی ڕۆمان بە بەرەوەیە دەتوانین بگەڕێینەوە نێوی-و دەیخەینەوە ناو قەفەسەکە. ئەمەم بە خۆم گوت و شەر و ئاشتی م هەڵگرت و نامەوە سەر جێگەی خۆی. لە لایەکی ترەوە، لەوانەیە ئەم ڕستە کەمانەی وا دەیانخوێنینەوە و تامیان دەکەین، سەرەتا بە ڕەنگاندنە شاد و ئاماژە پێدانە جوانەکەی خۆیان کاردانەوەیەکی خێرا و بەگوڕ بورووژێنن، بەڵام هەر لەوندەدا بوەستن، دەڵێی شتێك بەر بە پێشکەوتنەکەیان دەگرێ. یان لەوانەیە تاقە چەند هێڵی شاش و بێش لە سووچێکدا و چەند پەڵە جەوهەر لە سووچێکی تردا وەدەر کەون، بێ ئەوەی هیچ شتێکی پوخت و پاراوی لێ دیار کەوێت. ئەو دەم مرۆڤ لە ئەوپەڕی ناهومێدیان ئاخێك هەڵدەکێشێ و دەڵێ، ئەمەش دۆڕانێکی تر. ئەم ڕۆمانەش جێگەیەکی ناتەواوە.

هەڵبەت زۆربەی ڕۆمانەکان شتێکیان ناتەواوە. هێزی خەیاڵ لەبەر فرە ماندووبوون پەکی دەکەوێت. هێزی تێگەیشتن و بینایی دەشێوێ ئیتر ناتوانێ دروست لە نادروست لێك بکاتەوە ئیتر هێزی درێژە دان بە کارێکی گەورەی نییە وا هەردەم پێویستی بە کەڵکوەرگرتن لە هێزگەلی زەینی جۆراوجۆر و جیاواز هەیە. بەدەم ئەوەی کە چاوم لە جین ئەیر و ڕۆمانەکانی تر دەکرد لە خۆمم پرسی، بەڵام چلۆن گشتی ئەم پرسانە دەکەونە ژێر کاریگەری ڕەگەزی رۆماننوسەوە؟ ئایا جینسیەتی ژن بە جۆرێك ڕاستگۆییەکەی لە مەقامی رۆماننووسیدا تێك دەدات؟ -ئەو ڕاستگۆییەی بە ڕای من بڕبڕەی پشتی نووسەرە-لەو بەشانەی جین ئەیر دا وا بۆم گێڕانەوە، بە ڕوونی دیارە کە ڕق ڕاستگۆییەکەی رۆماننووس، واتە شارلۆت برۆنتێی، تێکداوە. ئەو چیرۆکەکەی خویی، کە دەبوو گشت هەوڵ و تەقەلاکەی خۆی بۆ تەرخان بکردایە، بەڕەڵڵا کردوە تاوەك خەریکی دەنگ هەڵبڕینێکی تاکەکەسی بێت. لە بیری دێتەوە لەو ئەزموونەی کە مافی خۆی بوو بێبەش کراوە-ناچار بووە لە ماڵە قەشەیەکدا گۆرەوی بدوورێتەوە و بڕزێ، لە حاڵێکدا پێی خۆش بووە ئازاد و ڕەها لە دونیادا بخولێتەوە. هێزی خەیاڵەکەی لەبەر ڕق هەستان لە ڕێگەی خۆی لایداوە و ئێمە هەست بەم لادانە دەکەین. بەڵام، جگە لە ڤین، هۆگەلێکی تریش کاریگەرییان دەبێ بەسەر هێزی خەیاڵەکەوەی و تووشی لە ڕێگە لادانی دەکەن. بۆ وێنە، نەزانی. وێنەی ڕاچێستێر لە تاریکاییدا کێشراوەتەوە. کاریگەری ترسی بەسەرەوە دەبینین هەر بەو جۆرەی پەیتا پەیتا هەست بە پەژارە و دڵ ئێشاوییەك دەکەین کە بەرهەمی زوڵم لێکراویە و ڕەنجێکی شاراوە کە وەك ئاوری خەڵوزێك هەیەجان و هەرا و هاوارەکەی دەسووتێنێ، و کینەیەك کە ئەو کتێبانەی، بەو گشتە جوانییەیانەوە، تووشی کەموکووڕیی کردووە.

چونکە ڕۆمان ئەم هاوگریەی لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینە هەیە بایەخەکانی کەم تا کورت هەمان بایەخەکانی ژیانی ڕاستەقینەن. بەڵام ئەوە ڕوونە وا بایەخەکانی ژنان زۆر جاران لەگەڵ ئەو بایەخانەی بە دەستی ڕەگەزی تر داندراون جیاوازە ئەوە ئاساییە. بەم حاڵەشەوە، ئەوە بایەخەکانی پیاوانە وا زاڵ دەبن. نموونەی وەلانراوی ئەوەیە وا تۆپی پێ و وەرزش «گرنگ»ن و وەدووی مۆد کەوتن و جل کڕین «بێ بایەخ». و ئەم بایەخانە بە ناچار لە ژیانەوە دەگوازرێنەوە ناو چیرۆك. ڕەخنەگر پێی وایە فلانە کتێب گرنگە چون لە بارەی شەڕەوەیە، و فیسارە کتێب بێ بایەخ لەبەر وەی باسی ئێحساساتی ژنان لە ژووری دانیشتن دەکات. دیمەنێکی گۆڕەپانی شەڕ گرنگترە لە دیمەنێکی دوکانێك-جیاوازی بایەخەکان لە گشت شوێنێك و لە ئەوپەڕی جوانیدا داندراوە. کەواتە، تەواوی پێکهاتەی ڕۆمانی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەگەر ڕۆماننووس ژن بووبێ، زەینێك سازی کردوە، کە هەندێك لە ڕێگەی ڕاستی خۆی لایداوە، و ناچار کرابوو تێڕوانینی ڕوون و ئاشکرای خۆی بە قازانجی دەسەڵاتێك لە دەرەوەی خۆی بگۆڕێت. ئەوندەی دەوێت ئەو ڕۆمانە لە بیرەوە چووە کۆنانە هەڵدەینەوە و سەرنج بدەینە ئەو شێوە دەربڕینەی وا بە سەریاندا زاڵە تاوەك لەوە بگەین نووسەر تووشی ڕەخنە هاتووە ئەو قسەکەی بە ناتەبایی دەکات یان ئەو بابەتە بە مەبەستی سوڵح و ئاشتی دێنێتە گۆڕێ. قەبووڵی دەکات، کە «تاقە ژنێك»ـە، یان دەنگ هەڵدەبڕێ کە «هیچی لە پیاو کەمتر نییە.بە لەبەر چاو گرتنی خوو و خدەی خۆی تووشی ڕەخنە دەبێتەوە یان بە مل دانوواندن و بێ باوەڕی بە خۆ، یان بە ڕق و دان پێدانان. گرنگ نییە چۆن بەرەنگاری دەبێتەوە گرنگ ئەوەیە وا سەبارەت بە شتێ جگە لە خولقاندنی خۆی بیری کردووەتەوە. کتێبەکەی وەك بەڵایەك بە سەرماندا دەبارێ. هەڵەیەك لە ناخی ئەم کتێبەدا هەیە. وەبیر هەموو ئەو ڕۆمانانەی ژنان کەوتمەوە وا، وەك ئەو سێوە ڕزیوە بچووکانە دەچوون، کە لە باخدا بڵاو بوونەتەوە، لە پەنا و پەسیوی کۆنە کتێبفرۆشیەکاندا کەوتوون. ئەو هەڵەیەی لە ناخیاندا بوو، فەوتاندبوونی. ژنی نووسەر بایەخەکانی خۆی بە ئاراستەی ڕای خەڵکی گۆڕیبوو.

بەڵام بێ گومان بۆ هیچیان بە هیچ چەشنێ نەدەلوا کە بە لای ڕاست یان چەپدا خوار نەبنەوە. لەو کۆمەڵگە تەواو پیاو سالارەدا، چ ڕادەیەك لێهاتوویی و ڕاستگۆیی پێویست بوو تا، سەرباری ئەو گشتە ڕەخنەیە، توند بە ڕایەکەی خۆیەوە بنووسێ و پاشەکشێ نەکات؟ تاقە جین ئاستەن ئەم کارەی کرد و ئیمیلی برۆنتێ. شتێکی ترلە هەوێنی ئەواندا بوو، ڕەنگە باشترین شت. ئەوان بەو جۆرەیان نووسی وا ژنان دەنووسن، نەك بەو جۆرەی پیاوان دەنووسن. لەو هەزار ژنەی لەو سەردەمەدا ڕۆمانیان نووسی، تاقە ئەم دوو کەسە گوێیان بە تێبینییە لە پەستاکانی مامۆستای توند و تیژ نەبزووت- ئاوا

بنووسە، ئاوا بیر بکەرەوە. تاقە ئەو دوو کەسە ئەو دەنگە پێداگر و بێ پسانەوەیان نەدەبیست وا جار جار دەیبۆڵاند، جار و بار لە ڕووی گەورەبییەوە هانی دەدان، جار و بار ناچاری دەکردن، جار جارە واق وڕماو، جار جارە توورە، جار جارە دلۆڤان، هەمان ئەو دەنگەی دەسبەرداری ژنان نابێ و لێیان ناگەڕێ، بەڵکە دەبێ وەك مامۆستایەکی بە ویژدان بەردەوام دەنگیان بدات وەك سێر ئێگرتۆن بریجێز ئەمریان پێ بکات تا خۆیان چاك کەن و تەنانەت لە لێکۆڵینەوەی شیعریشدا جنسیەت بخاتە بەر ڕەخنە"[١٢٩] و ئەگەر ئیشەکەیان باش بێت و ئەگەری بردنەوەی خەڵاتێکی باشیان هەبێ، دەنگیان بدات وا لەو سنوورە دیاریکراوەی ئەو ئاغایە پێی باشە تێنەپەڕن. «... ژنانی ڕۆماننووس دەبێ تەنیا بە قەبووڵکردنی ئازایانەی کەموکوورپەکانی ڕەگەزی خۆیان ئاواتی پایەبەرزی بخوازن."[١٣٠] گێڕانەوەی ئەم شتە بابەتەکە نەختێك ڕوون دەکاتەوە ئەگەر پێتان بڵێم ئەم ڕستەیە نەك لە ئوتی ١٨٢٨ بەڵکو لە ئوتی ١٩٢٨ نووسراوە و پێموا لەگەڵ مندا بێن بۆ وەی کە ئەم قسەیە، هەر چەندەش ئێستەکە پێمان قسەیەکی خۆش و پێکەنینی بێت، نۆینەری بیر و ڕای خەڵکێکی بێ ژومارە-بە هیوا نیم کای کۆن بە با کەم، تاقە کەڵك لەو شتە وەر دەگرم وا بە هەڵکەوت تووشی هاتووم-و سەدەیەك لەمەوبەر زۆر بە دەسەڵاتتر و باوتر بووە. ژنێك وا لە ساڵی ١٨٢٨ ئاوڕی لەو هەموە جنێو و بەگژداچوون و خەڵاتەبەڵێندراوە نەدەداوە، ڕەنگە ژنێکی لاوی زۆر بە هێز بووبێ. ڕەنگە ئەهلی گێرەشێوێنی و ئاژاوەگێڕی بووبێ وا توانیویەتی بە خۆی بڵێ: «بەڵام ئەوان ناتوانن ئەدبیاتیش بکڕن. دەرکی ئەدبیات بۆ هەموان ئاواڵەیە. بە تۆ، تەنانەت ئەگەر ڕاسپاردەش بی، ئیجازە نادەم لە ناو چیمەنەکە دەرمکەیت. ئەگەر پێت خۆشە، دەرکەی کتێبخانەکانت قوفڵ، کە بەڵام بە هیچ درگایەك، و بە هیچ قوفڵێك، و بە هیچ ئاڵقەڕیزێك ناتوانی زەینی من کۆت و زنجیر کەی.

بەڵام دڵساردکردنەوە و ڕەخنە لێگرتن هەر کاریگەرییەکی لەسەر نووسینەکەیان هەبووبێ، کە بە ڕای من کاریگەرییەکی یەکجار زۆری هەبوو. -بە بەراورد کردن لەگەڵ ئەو کێشەیەی دیکە وا تووشی

---

١٢٩- «ئەو مەبەستێکی بەپێچ و پەنای هەیە، و ئەمە سەرقاڵیەکی زەینی مەترسیدارە، بە تایبەت بۆ ژنان، لەبەر وەی ژنان زۆر کەم وەکی پیاوان فەنی ڕەوان بێژی و دەمپاراویان بە دڵ خۆش دەوێت. ئەمە کەمایەسیەکی سەیرە لەم ڕەگەزەدا، ڕەگەزێك وا لە بوارەکانی تردا زۆر سەرەتایی تر و مادیترە.

١٣٠- «ئەگەر ئێوەش، وەك ئەو هەواڵنێرە، لەسەر ئەو بڕوایەن وا ژنان تاقە دەبێ بە قەبووڵکردنی ئازایانەی کەم و کۆڕیەکانی ڕەگەزی خۆیان ئاواتی پایە بەرزی بخوازن(جین ئاستەن پیشانی دا وا ئەم کارە بە چ لەسەرە خۆییەك دەکرێ)...(Life and Letters، اوت ١٩٢٨).

دەبوون بیّ بایەخ بوو(هێشتاش هەر بیرم لەو رۆماننووسانەی سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم دەکردەوە) کاتیّ ژنانی رۆماننووس دەیانویست بیرۆکەکانیان بهاونە سەر قاقەز، هیچ نەریتێکیان لەبەر دەستیدا نەبوو، یان ئەم نەریتە هێندە کەم و هیچەکە بوو، کە یاریدەیەکی وای نەدەدان. لەبەر وەی ئێمە ئەگەر ژنین، لە رێگەی دایکەکانمانەوە بیر دەکەینەوە. بیّ کەڵکە ئەگەر بۆ یارمەتی وەرگرتن بچینە لای پیاوانی کەڵە نووسەر، هەرچەندەش خۆیندنەوەی بەرهەمەکانی ئەوانمان پیّ خۆش بێت. لەمب، براون، تەکری، نیومەن، ئەستەرن، دیکێنز، دوکوینسی-یان هەر کەسێکی تر —هێشتاش یاریدەی کەسیان نەداوە، هەر چەندەش رەنگە ئەو ژنە فێڵ و تەڵەکەیەکیان لێوە فێر بووبیّ و بەرامبەری پێویستەکانی خۆی گۆڕیبێتی. کێش، خێرایی و جووڵەی زەینی پیاو هێند لەگەڵ تایبەتمەندیەکانی زەینی ژن جیاوازە کە ژن ناتوانیّ چی وای لێوە فێر بێت. هێشتا زۆری ماوە تا ئەو مەیموونە لاساکەرەوەیە بتوانیّ بە وردی و وەسواسەوە لاسایی بکاتەوە. لەوانەیە ئەو کاتەی ژنە نووسەر قەڵەمی نایە سەر قاقەز، یەکەم شت کە تێی گەیشت ئەمە بوو کە رستەیەکی هاو بەش بۆ کەڵك لیّ وەرگرتنی ئەو نییە. تەواوی رۆماننووسە گەورەکان، وەك تەکری و دیکێنز و بالزاك، کەڵکیان لە پەخشانێکی ئاسایی وەردەگرت، پەخشانێکی ئازا بەلام نەك ئاڵۆز، روون و ئاشکرا بەلام نەك دەگمەن، بە مۆرکی خۆیانەوە بیّ وەی لە سنووری زمانی باو بترازن. ئەوان پەخشانەکەی خۆیان لەسەر بنەمای رستەیەك دامەزران وا لەو سەردەمەدا باو بوو. ئەو رستەیەی وا لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا باو بوو شتێك بوو وەك ئەمە: «گەورەیی بەرهەمەکانیان دەبووە هۆیەك نەك بۆ راوەستان، بەڵکە بۆ درێژە پێدان. بۆ وان ئەو پەڕی هەیەجان و قاییل بوون لەوەدا بوو هونەرەکەیان بەدی بێنن و لە پەستا حەقیقەت و جوانی بەرهەم بێنن. سەرکەوتویی دەبێتە هۆی هەوڵ دان و خوو گرتن رێگە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتویی خۆش دەکات. ئەمە رستەی پیاوێکە لەو بەریەوە دەکریّ چاوت بە جانسۆن، گیبوون"[١٣١]" و ئەوانیتر بکەوێت. ئەم رستەیە بۆ کەڵك وەرگرتنی ژن گونجاو نەبوو. شارلۆت برۆنتیّ، بەو گشتە لێهاتوویە بیّ وێنەیەی لە بواری پەخشاندا هەیبوو، لاقی گیرا لەو چەکە سەرەرۆییەی دەستی دابوویّ و بە عەرزیدا دا. جۆرج ئیلیۆت بەو کارەساتانەوەی وا سازیکردن، کە هەر وەسف ناکرێن. جین ئاستەن چاوێکی لێکرد و پیّی پێکەنی و رستەیەکی زۆر ئاسایی و خۆش دەستی بۆ خۆی داهێنا و قەت دەستی لیّ هەڵنەگرت. لەم سۆنگەیەوە، هەر چەندە لە چاو شارلۆت برۆنتیّ مرخێکی کەمتری لە بواری نووسیندا هەبوو، قسەکانی خۆی زۆر باشتر لەو بەیان کرد. لە راستیدا، چونکە

131- Gibbon

هونەر لە خۆیدا ئازادی و پوختە بێژی تێدایە، ئەم نەبوونی نەریت، و لەبەر دەستا نەبوونی کەرەستە و ئامرازە، بە دڵنیاییەوە کاریگەرییەکی گەورەی لە سەر نووسینی ژنان داناوە. بێجگە لەمە، بە لە پەنای یەکتر دانانی ڕستەکان ناکرێ کتێب ساز کەیت، بەڵکو-ئەگەر ئەم تەمسیلە بە هاناوە بێ-دەبێ بە ڕستەکان بن میچ و گومەزی ساز کەی تا کتێبەکە بیچم بگرێت. و ئەم شکڵەش بە دەست پیاوان و بە ئاراستەی پێویستیەکانیان و و بۆ کەڵك وەرگرتنی وان ساز کراوە. هۆیەکی نییە کە پێمان وابێ شکڵی حەماسە یان شانۆنامەی هەڵبەستراو بۆ ژن لەو ڕستەیە باشترە. بەڵام کاتێ کە ژن بووە نووسەر، تەواوی شێوازە کۆنەکانی ئەدەبی بە تەواوێت سەقامگیر ببوون. تاقە ڕۆمان ئەوندە لاو بوو، کە لە ناو دەستەکانیدا بیچم بگرێت-لەوانەیە ئەمە هۆیەکی تر بێ بۆ وەی ژنان ڕوو بکەنە رۆماننووسین. ئاواش، کێ دەتوانێ بڵێ وا تەنانەت ئێستەکە «ڕۆمان» (دەیخەمە ناو دووکەوانەوە تا جەخت لە سەر ڕای خۆم لە هەمبەر ناتەواوی ئەم وشەیە بکەمەوە.)، ئەم نەرمونیانترین شێوازە، شێوازێکی باشە بۆ کەڵك وەرگرتنی ژنی نووسەر؟ بێ گومان دەبینین ئەو، کاتێ کە بتوانێ بە ئەندامەکانی لەشی خۆی بە ئازادی کار بکات، بۆ کەڵك وەرگرتنی خۆی دەیگۆڕێ و ئامرازێکی نۆی، نەك حەتمەن هەر بە هەڵبەست، بۆ بەیانکردنی شاعیریەتی ناخی خۆی دابین دەکات. لەبەر وەی ئەمە هێشتا هەرێمی شیعرە کە ژنان لە چوونە ژوورێی بێبەش کراون. پاشان لە خۆمم پرسی وا ئەوڕۆکە چلۆن ژنێك تراژێدیەکی هەڵبەستراو لە پێنج پەردەدا دەنووسێ-ئایا شێعری تێدا بەکار دێنێ-ئایا وای پێ باشتر نابێ کەڵك لە پەخشان وەرگرێت؟

بەڵام ئەمانە پرسیار گەلێکی دژوارن وا وڵامەکەیان لە ناو جیهانی پڕ نهێنی و ڕەمزاوی داهاتودا شاردراوەتەوە. دەبێ لە کۆڵیان ببمەوە، تەنانەت ئەگەر تاقە هۆیەکەشیان ئەوە بێ وا من هان دەدەن بۆ وەی لە بابەتەکەی خۆم لادەم و لە ناو دارستانگەلێکی چڕوپڕدا بسووڕێمەوە وا تیایاندا ون دەبم و بە ئەگەرێکی زۆر ئاژەڵە کێویەکان قوتم دەدەن. من زۆرم دڵ پێوە نییە، و دڵنیاشم ئێوەش ناتانەوێ ئەو بابەتە زۆر خەم بزوێنە، واتە داهاتوی چیرۆك، بهێنمە گۆڕێ. کەواتە تاقە ساتێك لێرادا ڕادەوەستم تا سەرنجی ئێوە بۆ لای دەوری گرینگی هەلومەرجی جەستەیی ژنان لە داهاتودا ڕابکێشم. کتێب دەبێ بە چەشنێ لەگەڵ جەستەی ئەوان سازگار بێت، و تەنانەت دەکرێ بە غیرەتێکی زۆرەوە بڵێی وا کتێبی ژنان دەبێ لە هی پیاوان کورتتر بێت، و لە قەبارەیەکدا تۆمار کرێت کە پێویستی بە چەندەها کاتژمێر کاری بێوچان نەبێت. لەبەر وەی دایمە وچاندان هەر دەبێ. هەروەها وادیارە ئەو ئەعسابەی مێشك دنە دەدەن لە پیاوان و ژناندا جیاوازە، و ئەگەر دەتانهەوێ ژنان باشتر و کاری گرانتر بکەن، دەبێ لەوە بگەن چ جۆرە ئاکارێك لەگەڵ وان باشتر دەگونجێ. -بۆ وێنە ئایا ئەم کاتژمێرە وانانەی وا

وێدەچێ چلەکێشان بە سەدان ساڵ لەمەوبەر دایانهێنابێ، بە کەڵکیان دێت؟ -چەلی کاتی ئیشەکەیان و پشودانەکەیان دەبێ چلۆن بێت، بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی کە مەبەست لە پشودان ئەوە نییە، کە هیچ کارێك نەکەن، بەڵکو ئەوەیە کە کارێکی جیاواز بکەن، و ئەو جیاوازیە دەبێ چی بێت؟ گشت ئەم پرسانە دەبێ بکەونە بەر باس و ڕوون بکرێنەوە هەمووی ئەمانە بەشێکن لە پرسی ژن و چیرۆك. بەم حاڵەشەوە، بەدەم ئەوەی دیسانەوە بەرەو قەفەسەی کتێبەکان دەچووم، لە خۆمم پرسی، لە کۆی دەبێ ئەو لێکۆڵینەوەیە تێر و تەسەلە سەبارەت بە دەروون ناسی ژنان بە قەڵەمی ژنێك بدۆزمەوە؟ ئەگەر ژنان لەبەر وەی ناتوانن تۆپانێ بکەن ئیجازەی ئەوەیان نادرێتێ خەریکی پزیشکی بن....

بەختەوەرانە ئێستەکە فیکرەکانم بەرەو لایەکی دیکە دەچوون.

# بەشی پێنجەم

سەرئەنجام، بە دەم ئەم قسە ئالۆزانەوە گەیشتبوومە ئەو قەفەسانەی وا کتێبی نووسەرە زیندووەکانی بە ژن و پیاوەوە تێدا بوو. لەبەر وەی ئێستاکە ڕەنگە ئەوندە کتێب بە قەڵەمی ژنان نووسرابێ. وا بە قەڵەمی پیاوان نووسراون. یان ئەگەر ئەم شتە هێشتا لە سەتا سەت نەهاتبێتە دی، و ئەگەر هێشتاش پیاو ڕەگەزی زۆربڵە و چەنەوەڕن، بە دڵنیاییەوە ئەم شتە حەقیقەتی هەیە، کە ژنان ئیتر هەر ڕۆمان نانووسن. جین هاریسۆن"[١٣٢]"چەند کتێبی سەبارەت بە کەون ئارا ناسی نووسیوە، وەرنون لی"[١٣٣]"سەبارەت بە جوانی ناسی، گەرترۆد بێل"[١٣٤]" سەبارەت بە ئێران. کتێبگەلێك بە بابەتگەلی جۆراوجۆر کۆ کراونەتەوە کە ژنانی جیلی ڕابردوو نەیاندەتوانی بیاننووسن. شیعر و شانۆنامە و ڕەخنە مێژوو و ژیاننامە، سەفەرنامە و کتێبگەلی ئاکادێمیك و لێکۆلەرانە چەند کتێبی فەلسەفی و زانستی و ئابوری. و هەرچەندەش هێشتا زۆربەیان ڕۆمانن، خودی ڕۆمانیش لەبەر پێوەندیکردنی بە کتێبگەلی جیا جیاوە گۆڕدراوە. ڕەنگە سانایی سروشتی، و سەردەمی خولقاندنی حەماسە لە نووسراوەکانی ژناندا بە کۆتایی گەیشتبێ. ڕەنگە خوێندنەوە و ڕەخنە سنوورێکی بەربلاوتر و جوانییەکی زۆرتری پێدابێ. ڕەنگە هۆگری بە نووسینی ژیاننامەی تاکە کەسیەوە تەواو بووبێ. ڕەنگە ژنان نووسینیان وەك هونەر نەك وەکی شێوازێك بۆ بەیانکردنی خۆیان دەسپێکردبێ. ڕەنگە بکرێ بە وڵامی زۆریەك لەم پرسیارانە لە ناو ئەم ڕۆمانانەدا بگەی.

هەروا بە هەڵکەوت دەستم دا یەکیان. لە بنەوەی قەفەسەکەدا بوو و نێوەکەی بەسەرهاتی ژیان "[١٣٥]"یان شتێکی لەو جۆرە بوو، نووسراوەی مێری کارمایکێل، و هەر لەم مانگە ئۆکتۆبەرەدا بڵاو ببوەوە. لەبەر خۆمەوە وتم، لەوە دەچێ یەکەم کتێبی بێ، بەڵام دەبێ وای بخوێنییەوە وەك ئەوەی دوایین جلدی کۆمەڵەیەك بێ، درێژەی هەموو ئەو کتێبانەی وا چاوێکم لێ کردوون-شیعرەکانی لێیدی وینچێلسی و شانۆنامەکانی ئافرابێن و ڕۆمانەکانی ئەو چوار ڕۆماننووسە گەورەیە. چونکە

---

132-Jane Harrison
133-Vernon Lee
134-Gertrude Bell
135- Lifes Adventure

کتێبەکان، هەر چەندە ئێمە خوومان بەوە گرتووە بە جیا هەڵیانسەنگێنین، درێژەی یەکترین. هەر وەها دەبێ ئەو- ئەم ژنە نەناسراوە-لە بنچینەی گشت ئەو ژنانەی دی دابنێم کە هەلومەرج و بارودۆخیانم لەبەر چاو گرتوە و بزانم لە تایبەتمەندی و کەند و کۆسپەکانیان چی بە میرات پێ بڕاوە. چونکە ڕۆمانەکان زۆر جاران ژانبڕن نەك دەرمان، و لە جیات ئەوەی کە بمانچزێنن و لە خەومان هەستێنن بە کاس و وڕی دەمانخەوێنن، ئاخێکم هەڵکێشا و دەفتەرچە و قەڵەمێکم هەڵگرت و دانیشتم تا بزانم لە یەکەم ڕۆمانی مێری کارمایکێل، بەسەرهاتی ژیان، چیم وەدەست دەکەوێ.

لە پێشدا چاوێکم لە سەر تاپاخوارێی لاپەڕەکە کرد. لەبەر خۆمەوە کوتم، بەر لەوەی کە مێشکی خۆم پڕ کەم لە چاوی شین و قاوەیی و بوون و نەبوونی پێوەندی کلۆئی"[136]" لەگەڵ ڕاجێر"[137]"، دەمهەوێ فرت و فێڵی ڕستەکانیم بێتە دەستی. بۆ لەبەرکردنی ئەو زانیاریانە دەرفەت هەیە سەرەتا دەبێ بزانم ئەو قەڵەمی بەدەستەوەیە یان قوڵینگ. بۆیە یەك دوو ڕستەم خۆیندەوە و زۆر زوو وەدەر کەوت ئاریشەیەکی هەیە. ڕستەکان بە نەرمی بەدووی یەك دا نەدەهاتن. شتێك لێك دەپچڕا، شتێك زەینمی دەڕنی وشەیەك بە تەنیا لێرە و لەوێ بەبەر چاومەوە بریقە بریقی دەهات. وەك دەڵێن، خەریك بوو پەلەقاژێی دەکرد بۆ وەی خۆی ڕزگار کات. بیرم کردەوە ئەو وەك کەسێك وایە کە خەریکی هەڵکردنی شەمچەیەکە وا هەڵنابێ. لەوم، وەك بڵێی لەوێ بێ، پرسی، بەڵام بۆ چی ڕستەی لە جۆری جین ئاستەن بۆ تۆ بەکار نایات؟ ئایا لەبەر ئەوەی ئێما"[138]"و ئاغای وودهاوس"[139]"نەماون دەبێ هەموویان حەوا دەین؟ ئاخێکم هەڵکێشا و لەبەر خۆمەوە وتم، مەخابن کە دەبێ وابێ. چون بە بەراوردکردنی لەگەڵ جین ئاستەن، کەوەك موتسارت مێلۆدی بە مێلۆدی و هەوا بە هەوا دەچێتە پێش، خۆیندنەوەی ئەو نووسراوەیە وەك ئەوە بوو لە ناو گەمیەکدا لە ناوەڕاستی زەریا دانیشتبێتین. دەچووینە سەر و دەهاتینەوە خوار. ئەم کورتکردنەوە و ئەم لەتە لەتە نووسینە، ڕەنگە بەو واتایە بێ کە لە شتێك ترساوە ڕەنگە دەترسا پێی بڵێن «ئێحساساتی» یان ئەوەی لە بیر بووە کە بە نووسراوەکانی ژنانیان گرێ و گۆڵاوی دەوت، بۆیە لە جیات لق و پۆپ دان بە نووسراوەکەی پڕی کردووە لە دڕوو بەڵام تا دیمەنێك بە وردی نەخۆێنمەوە، ناتوانم لەوە دڵنیا بم وا ئەوە خۆیەتی یان خەریکی دەورگێڕانە. بە سەرنجدانێکی پترەوە خەریکی خوێندنەوە بووم و بیرم کردەوە، هەر چۆنێك بێ گوڕ و تینی خۆینەر لە ناو نابات. بەڵام زانیاریگەلێکی زۆر لەسەر

136- Chloe
137- Roger
138- Emma
139- Woodhouse

یەك کەڵەکە دەکات. لە کتێبێکی ئەونددا (نزیکەی نیوەی جین ئەیر بوو) ناتوانێ تەنانەت لە نیوەشیان کەڵك وەرگرێت. کەچی ئاواش، بە چەشنێك توانیبووی گشتمان-راجێر، کلۆئێ، ئیلیویا، تۆنی و ئاغای بیگام"[١٤٠]" لە ناو گەمیەکی سەر چۆمی دانیشێنێ. پاڵمدا بە پشت کورسیەکەمەوە و لەبەر خۆمەوە وتم، نەختێ ڕاوەستە بەر لەوەی کە بچمە پێشتر، دەبێ تەواوی ڕووداوەکە بە سەرنجدانێکی زۆرترەوە لە بەر چاوگرم.

لەبەر خۆمەوە گوتم، نەختێ دڵنیام لەوە کە مێری کارمایکێل خەریکە فێڵمان لێ دەکات. چون لە کەسێك دەچووم لە ناو قەتارێکدا بێ و لە ڕێگەیەکی پڕ لە هەورازەوە تێپەڕێ قەتارەکە کە سووکی دەکاتەوە، لەوە دەچێ دەیهەوێ ڕاوەستێ، کەچی لە جیات ڕاوەستان، لە پێچەکەوە تێدەپەڕێ و دیسانەوە خێرای دەکاتەوە. مێری ڕیزبەندی و دوابەدوایە خووپێگرتووەکەی تێکدەدا. سەرەتا ڕستەی گۆڕیبوو، ئێستەکە ریزبەندی و دوابەدوایی. قەیدێناکا، تەواو پێی ڕەوایە ئەم کارانە بکات، بە مەرجێك لە سۆنگەی ئافراندنی هونەریدا بێت. تا کاتێك خۆی نەخاتە هەلێکی تایبەتەوە و تووشی نەیات، ناتوانم بە خاترجەمیەوە بڵێم لەم دوو کارە کامیان دەکات. لەبەر خۆمەوە کوتم، ئازادی تەواوی پێدەدەم تا ئەو هەلە تایبەتە هەڵبژێرێ ئەگەر پێی خۆش بێ دەتوانێ ئەو هەلە بە قوتوە تەنەکە و کتریە کۆن بڕەخسێنێ بەڵام دەبێ قایلم کات وا ئەم هەلە بە ڕای ئەو هەلێکی تایبەتە، وە پاشان کاتێك پێکی هێنا، دەبێ لەگەڵی ڕووبەڕوو بێتەوە. دەبێ باز بدات. بڕیارم دا ئەگەر ئەو ئەرکی وەك نووسەر بە جوانی تێپەڕێنێ، منیش وەك خوێنەر ئەو ئەرکە بە باشی بەڕێوە بەرم و کتێبەکەم هەڵداوە و خوێندمەوە.... داوای لێبوردن دەکەم قسەکەم ئاوا لە ناکاو دەبڕم. پیاوێك لەوانەدا نییە؟ بەڵێن دەدەی ئا لەوێ، لە پشتی ئەو پەردە سوورە، جەستەی سێر چارترز بایرۆن"[١٤١]" نەشاردرابێتەوە؟ خاتر جەمم دەکەن کە هەمووومان ژنین؟ کەوابێ دەتوانم پێتان بڵێم ئەو وشانەی لە پاشان خوێندمنەوە ئەمانە بوون: «کلۆئێ ئێلیویای خۆش دەویست....هەڵمەبەزنەوە .سۆور هەڵمەگەڕێن. لێگەڕێن لە نێو کۆڕەکەی خۆماندا ئەوە قەبووڵ کەین، کە جارجار شتی وا هەڵدەکەوێت. ژنان جاری وایە ژنانیان خۆش دەوێت.

«کلۆئێ ئێلیویای خۆش دەویست. ئەم دەستەواژەیەم خوێندەوە و لەپڕ تێگەیشتم چ گۆڕانکاریەکی گەورە قەوماوە. ڕەنگە بۆ یەکەم جار بوو لە ئەدەبیاتدا، کلۆئێ ئێلیویای خۆش دەویست. کلیۆپاترا ئۆکتاویا ی خۆش نەدەویست. و شانۆنامەی ئانتۆنی و کلیۆپاترا چەندە دەگۆڕا

---

140- Bigham
141- Sir Chartres Biron

ئەگەر کلیۆپاترا ئۆکتاویای خۆش ویستایە! بەداخەوە لێگەڕام زەینم تۆزێ لە بەسەرهاتی ژیان دوور کەوێتەوە و بیرم کردەوە، لە هەل ومەرجی ئێستادا گشتی بابەتەکە، ئەگەر بوێرین بیلێین، زۆر گەمژانە شتێکی سانا و ساختەچی لێ دەرهاتووە. تاقە هەستی کلیۆ سەبارەت بە ئۆکتاویا بەخیلایەتی پێکردنە. ئایا ئەو لە من بالآ بەرزترە؟ قژی چۆن جوان دەکات؟ لەوانەشە شانۆنامەکە لەوە زیاتری نەوەێ. بەڵام چەندە خۆش دەبوو ئەگەر پێوەندی نێوان ئەم دوو ژنە گرێ و گۆڵی زێتر تێدا بووایە. خێرایەکی لە زەینمدا بە کۆمەڵەی بەشکۆی ژنانی چیرۆکدا چوومەوە و لەبەر خومەوە وتم، هەمووی ئەم پێوەندیانەی نێوان ژنان زۆر ساکارە. زۆر شتیان لەبەر چاو نەگرتووە و کاریان لەسەر نەکراوە. هەوڵم دا لە نێو ئەو شتانەی وا خوێندبوومەوە شتێك وەبیر خۆم بێنمەوە کە تیایدا دوو ژن وەك دوو هاورێ وێنا کرابن. لە دیانای جادەکان"[١٤٢]"دا، کۆششێك لەم بارەوە کراوە. هەڵبەت ژنان لە بەرهەمەکانی راسین و تراژێدیە یونانییەکاندا پارێزەری سڕەکانی یەکترن. جاروبارێکیش دایك و کچن. بەڵام مەزانە هەموویان لە پێوەندیان لەگەڵ پیاوان دێنە ئاراوە. پێم سەیر بوو کە تەواوی کەڵە ژنانی چیرۆك تا سەردەمی جێن ئاستەن نەك هەر لە تێڕوانینی ڕەگەزێکی ترەوە، بەڵکە هەر لە پێوەندیان لەگەڵ ئەو ڕەگەزەوە هاتوونەتە ئاراوە. ئەمە بەشێکی زۆر بچووکی ژیانی ژنە و کاتێ پیاو لەوبەری ئەو چاویلکەیە ڕەش یان سپیەی وا جینسیەت کردویەتە چاوی، چاو لێ دەکات، لەم بەشە بچوکەش شتێکی وای وەچنگ ناکەوێت. ڕەنگە ئەو سروشتە سەیرەی ژن لە چیرۆکدا هەر لەم شتەوە سەرچاوە بگرێ جوانی و ناحەزیە زۆر پێوەنراو و سەرسووڕ هێنەرەکەی، و لەرەکردنەکەی لە نێوان پاکی بەهەشت و دزێوی دۆزەخدا- چونکە خۆشەویستەکەی، بە ڕێژەی هەڵچوون و داچوونی خۆشەویستیەکەی، و ئەوەی کە بە مراد بگات یان نامراد بێ، ئاوای دەبینێت. هەڵبەت ئەم شتە سەبارەت بە رۆماننووسانی سەدەی نۆزدە زۆر وانییە. لە ڕۆمانەکانی واندا ژن جۆراوجۆرتر و بە پێچوپەناترە. لە ڕاستیدا، ڕەنگە هەر ئەم ئێشتیای نووسینەی لەمەڕ ژنانەوە تا ڕادەیەکی زۆر بووە هۆی ئەوە، کە پیاوان شانۆنامەی هەڵبەستراو، کە لەبەر ڕەق وتەقیەکەی کەمتر دەیتوانی کەلك لە ژنان وەرگرێت، بنێنە ئەولاوە و ڕۆمان وەك ژانرێکی باشتر داهێنن. هەر ئاواش، ڕوونە کە زانستی پیاو سەبارەت بە ژن، تەنانەت لە کتێبی پرۆستیشدا، زۆر ناتەواو و کەم و کۆڕە، هەر بەو جۆرەی زانستی ژن لەمەڕ پیاواندا.

---

١٤٢- Diana of the Crossways، ڕۆمانێکی جۆرج مێرێدیتە کە لە ساڵی ١٨٨٥ بڵاو بووەتەوە. و. ف

جارێکی تر چاوم لە لاپەڕەی کتێبەکە کرد و لە درێژەدا لەبەر خۆمەوە گوتم، بێجگە لەوە، وردە وردە ڕوون دەبێتەوە کە ژنانیش وەك پیاوان، جگە لە هۆگریە دایمیەکەی ماڵ و ژیان، هۆگریگەلی تریشیان هەیە. «کلۆئیێ ئۆلیویای خۆش دەویست. ئەوان لە تاقیگایەك هاوکار بوون...و درێژەم بە خوێندنەوەکەم دا و تێگەیشتم کە ئەم دوو ژنە گەنجە خەریکی وردکردنی جەرگن، کە وادیارە دەرمانێکە بۆ کەمخۆیینی زۆر هەر چەندە یەکێك لەو دوانە مێردی بوو-و ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبێم —دوو زارۆکی هەبوون. هەڵبەت دەبوو گوێت بە گشت ئەمانە نەدایە و لەم ڕووەوەیە وێنەی بەشکۆی ژنی چیرۆك لە ڕادەبەدەر ساکار و یەکجۆرە. بۆ وێنە، وای دابنێن پیاوان لە ئەدەبیاتدا هەر وەك دڵبەری ژنان وینا بکرایەن، و قەت هاواڵی پیاوان، سەرباز، ئەندێشمەند و خەیاڵ پەرداز نەبوایەن ئەو دەم چ ڕادەیەکی کەم لە شانۆ نامەکانی شکسپیریان پێ تەرخان دەکرا، و ئەدەبیات چەندە زەبری لێدەوەشا! لەوانەیە بەشێکی گەورەی «ئۆتێللۆ» و هەندێکی زۆری «ئانتۆنی» بمایەن، بەڵام ئیتر سیزار و بروتوس و هەملێت و لیر و جێیکز نەدەبوون. -ئەدەبیات بە چەشنێکی سەرسام هێنەر هەژار دەکەوت هەر بەو جۆرەی کە، لەبەر ئەو دەرکانەی وا لە ژنان پێوەدراون، بە شێوەیەکی باوەڕ پێنەکراو هەژار کەوتووە. ئەو دەمەی کە ژنان بە نابەدڵی شوویان دەکرد، لە ژوورێکدا دەبەسرانەوە، تاقە کارێکیان بوو، شانۆنامەنووس چلۆن دەیتوانی شتێکی تەواو یان سەرنجڕاکێش یان حەقیقی لەوان وێنا بکات؟ ئەوین تاقە ڕاڤەیەك بوو کە دەکرا. شاعیر ناچار بوو ئەویندارێکی زۆر بەتاسە یان زامدار بێ. مەگین لە ڕاستیدا بڕیاری دابوو لە ژنان«بێزار» بێت، کە زۆربەی جاران بەو واتایە بوو کە ژنان دڵێکیان بەوەوە نەبووە.

ئێستەکە ئەگەر کلۆئیێ ئۆلیویای خۆش دەوێ و لە تاقیگەیەکدا کار دەکەن، خۆ ئەو شتە هەر لە خۆوە دۆستایەتیەکەیان هەمە ڕەنگتر و ڕاوەستاوتر دەکات چون کەمتر لایەنی تاکەکەسی دەبێت ئەگەر مێری کارمایکێل بزانێ چۆن بنووسێ، و تێگەیشتم وا وردە وردە لە هەندێ لاوە شێوازی نووسینەکەیم پێ خۆش دەبێت ئەگەر ژوورێکی بۆ خۆی هەبێت، کە لەمەیان خاترجەم نیم ئەگەر ساڵی پێنسەد پاوەندی بۆ خۆی ببێت-کە دەبێ دواتر بسەلمێ-ئەو دەم پێموایە ڕووداوێکی زۆر گرنگ رووی داوە.

چونکە ئەگەر کلۆئیێ ئۆلیویای خۆش دەوەی، و مێری کارمایکێل بزانێ چۆن بەیانی کات، مەشخەلێك لە هۆڵێکی زۆر گەورە دادەگیرسێنێ، کە تا ئێستەکە کەس ڕێی تێ نەکەوتووە. سرانسەرەکەی ڕووناکایەکی کز و سێبەرێکی گەورە دایگرتووە، وەك ئەو ئەشکەوتە لە نێویەکانەدا، کە بە مۆمێکەوە وا بە دەستمانەوەیە تێوەیان دەچین و بە سەرنجەوە چاو لە هەموو

لایەکی دەکەین، بێ ئەوەی کە چاومان لەبەر پێمان بێت. جارێکی تر خوێندنەوەی کتێبەکەم دەست پێکردەوە، و ئەوەم خوێندەوە وا کلۆئێ چاوی لە ئۆلیویا دەکرد کە شووشەیەکی دەخستەوە ناو قەفەسەکە و کوتی کاتی ئەوەیە بچێتەوە ماڵێ بۆ لای منداڵەکانی. بە سەیرێکەوە وتم، ئەمە ئەو دیمەنەیە وا لە سەرەتای جیهانەوە نەبینراوە. منیش بە مووشە مووشێکی زۆرەوە چاوم لێکرد. دەمویست بزانم مێری کارمایکێل چۆن کارەکەی دەست پێ دەکات. و ئەو ئاماژە تۆمار نەکراوانەو، و ئەو وشە نەکوتراو یا نیوەکوتراوانە چۆن دەخاتە سەر زاری ئەو دەمەی وا ژنان بە تەنێن، و تیشکی ڕەنگاو و بگۆڕی ڕەگەزی تریان لێنادرێ، وەك نیسێی پەپوولەکان بە شێوەیەکی نادیار بیچم دەگرن. بەدەم خوێندەوە لەبەر خۆمەوە وتم، ئەگەر ئەو پێی خۆش بێ ئەو کارە بکات دەبێ زۆری ئاگا لە خۆبێ چون ژنان زۆر زەنینن لە هەر چەشنە خۆشەویستیەك، کە ئەنگیزە و هۆیەکی ڕوونی نەبێت. و زۆریان خوو گرتووە بە شت شاردنەوە و سەرکوتکردن. تا ئەو جێگەیەی هەر کە چاوێك بە سەریانەوە بێ، دەستبەجێ ڕاوەدەوەستن. بە مێری کارمایکێلم، وەك بڵێی لەوێ بێ، گوت، تاقە شتێکی کەدەتوانی بیکەی ئەوەیە کە هەر وەکی لە پەنجەرەکەوە چاوت بڕیوەتە شتێك باسی شتێکی دیکە بکەیت، بێ ئەوەی کە دەفتەرچەکە ڕەش کەیتەوە، هەر بە کورتترین دەستەواژەکان، و بەو وشانەی زۆر بە زەحمەت کورت دەکرێنەوە، ئەو شتەی کە دێتە گۆڕێ تۆمار بکەیت، لەو زەمانەی وا ئۆلیویا -ئەم بوونەوەرە گیانلەبەرەی وا میلیۆنان ساڵە لەبن سێبەری تەختە بەرددا بووە-هەستی کردووە تیشکێکی وێکەوتووە، و خواردنێکی سەیر دەبینێ کەبەرەو لای دێت، چێشتی زانست، ڕووداو و هونەر. جارێکی تر چاوم لە سەر لاپەڕەی کتێبەکە هەڵگرت و لەبەر خۆمەوە کوتم، و ئەو دەستی بۆ دەبات، و دەبێ تێکەڵاوێکی تەواو تازە لە هێزەکانی خۆی بێنێ بە هانای خۆیەوە-ئەو هێزانەی بەرەو مەبەستگەلێکی تر گەشەیەکی گەورەیان کردووە-تا بتوانێ نوێ بەرەو کۆنە ڕابکێشێت بێ ئەوەی کە هاوسەنگیە لەڕادەبەدەر پێچەڵاوپێچ و لەنێویەکەکەی کومەڵەکە تێکبدات.

بەڵام مەخابن، من دەستم دابووە کارێك کە لەسەر نەکردنەکەی سوور بووم بێ ئەوەی کە بیری لێ بکەمەوە خەریکی بەسەردا هەڵگوتنی ڕەگەزی خوم بووم. «گەشە ساندنی گەورە»-«لەڕادەبەدەر پێچەڵاوپێچ»-ئەم دەستەواژانە بێ گومان پێداهەڵگوتنیان تێدایە. و تاریفکردنی جینسیەتی خۆت دایمە جێی گومانەو و زۆر جارانیش حولانەیە بێجگەلەمە، لەم بابەتە تایبەتەدا، چۆن دەکرێ پاساوی بۆ بهێنییەوە؟ ناکرێ لەبەر نەقشەدا ڕاوەستی و بڵێی کریستۆف کلۆمب ئامریکای دۆزیەوە و کریستۆف کلۆمبیش ژن بوو یان سێوێك هەڵگری و بڵێی یاسای ڕاکێشانیش

نیۆتۆن دیەوە و نیۆتونیش ژن بوو یان فڕۆکەکان لە ئاسمان پیشان دەی و بلێی کە ژنان فڕۆکەیان ساز کردووە. نیشانەیەك بەسەر دیوارەکەوە نییە تا بتوانی بەرزایی بەژنی ژنانی بە جوانی پێبگری. شتێکی وا بۆ پێوانە کردن نییە کە زۆر بە وردی و ڕێکوپێك بە پێی سانتیمیتر بەش بەش کرابێ و بتوانێ تایبەتمەندیەکانی دایکێکی باش یان خۆشەویستی کچ، یا بەوەفایی خوشك، یان لێهاتووی کابانی پێ پێوانە بکەیت. تەنانەت ئێستەکەش، هەندێکی کەم لە ژنان لە زانکۆکان هەڵسەنگێندراون و نومرەیان گرتووە و زۆر کەم تاقیکردنەوە گەورەکانی پیشەیی، هێزی زەوینی و دەریایی، بازرگانی، ڕامیاری و دیپلۆماسیان تێپەڕاندووە. ئەوان تەنانەت لەم ساتەوەختەشدا زۆر وکەم پۆلێن نەکراو ماونەتەوە. کەچی ئەگەر بمەوێ هەر شتێکی بزانم وا کەسێك دەتوانێ بۆ وێنە لەمەڕ سێر هاولی باتز"[١٤٣]"پێم بلێ، ئەوندەی دەوێ کتێبی بۆرك"[١٤٤]"یان کتێبی دەبرەت"[١٤٥]" هەڵدەمەوە تاکوو بزانم ئەو فلانە بڕوانامەی خوێندنی وەرگرتووە خاوەنی ماڵێکی گەورەی ئاغاواتانەیە میراتگری هەیە سەرۆکی دەستەی بەڕێوبەران بووە نوێنەری بەریتانیای کەبیر بووە لە کانادا و فلانە ڕادە پلە، مەقام، میدال و ئیمتیازی تری وەدەست هێناوە، کە لێهاتوویەکانیان بۆ هەتا هەتا بە نێویەوە تۆمار کردووە. هەر خودا دەتوانێ زانیاری زێتری لەمەڕ سێر هاولی باتز هەبێ.

کەواتە کاتێ باسی «گەشە ساندنی گەورە» و «لەڕادەبەدەر پێچەڵاوپێچ»ی ژنان دەکەم، ناتوانم بۆ قسەکانی خۆم نە لە ساڵنۆینی ویکتەر"[١٤٦]"، نە لە کتێبی دەبەرت و نە لە ساڵنامەی زانکودا پشتیوانییەك ببینمەوە. لەم دۆخە ئەستەمەدا، چیم لە دەست دێ؟ جارێکیتر چاوم لە قەفەسەی کتێبەکە کرد لە ژیاننامەکان، ژیننامەکانی جانسۆن و گوتە و کارلایل و ئێستەرن و کوپێر و شێلی و ڤۆلتێر و براونینگ و زۆری دیکە. وەبیر گشت ئەو کەڵە پیاوانە کەوتمەوە وا ژنانیان بە هەر هۆیەك بێ پەسن کردوە و بارەقەڵایان پێگوتوون، بە دوویانەوە بوون، لەگەڵیان ژیاون، و خۆشیان ویستوون، باوەڕیان پێکردوون، سرِی خۆیانیان پێگوتون، لەبارەوەیان نووسیویانە، و بە کورتی بە جورێك پێویستی و بەندبوونی خۆیانیان بە کەسانێکی تایبەت لە ڕەگەزی بەرامبەر نیشان داوە. ناڵێم هەمووی ئەم پێوەندیانە لە سەتا سەت پاك وبێگەرد بووە لەوانەشە ئاغای ویلیام جۆینسۆن هیکز"[١٤٧]"حاشا لەو شتە بکات. بەڵام ئەگەر جەخت لەسەر ئەوە بکەین وا ئەم کەڵە پیاوانە جگە

---

143- Sir Hawley Butts
144- Burke
145- John Debrett
146- Whitaker
147- Sir William Joynson Hicks

لە ئاسایش، ماستاوچیەتی و چێژوەرگرتنی جەستەیی شتێکی تریان لەم پێوەندیانە پێ نەبڕاوە، زۆرمان بێ ئینسافی لەگەڵ کردوون. بە دڵنیاییەوە ئەو شتەی بەم پیاوانە بڕا شتێك بوو وا ڕەگەزی خۆیان نەیدەتوانی بۆیانی دابین کات و ڕەنگە لەخۆڕاش نەبێ ئەگەر، بێ دەستەودامێن بوونی وتەی بەگوڕ و یەکلا کەرەوەی شاعیران، بە جۆرە هاندەرێکی بزانین، چەشنێك ژیاندنەوەی هێزی داهێنەرانە، وا هەر ڕەگەزی بەرامبەر دەتوانێ دابینی کات. بیرم کردەوە کە پیاو درگای دیوی دانیشتن یان کایەی منداڵەکانی دەکردەوە، و ڕەنگە ژنەکەی لە نێو منداڵەکانیدا دەدیەوە، یان لە کاتی گوڵ چنین-هەر چۆن بێ، لە ناوەندی نیزامێکی جیاواز لە ژیان- و جیاوازی ئەم جیهانە و جیهانی پیاو، کە لەوانە بوو دونیای دادگاکان و مەجلیسی عەوام بێ، دەستبەجێ وەگۆڕی دەخستەوە و ورەی دەدا بەر. بە دووی ئەوەدا، تەنانەت لە ساکارترین قسەکانیشدا ڕای ناکۆکی هێند ئاسایی دەهاتە گۆڕ کە تەنانەت ڕا مردووەکانی پیاوەش دیسان دەژیانەوە و دیتنی ژن، کە لە کەشێکی جیاواز لەگەڵ کەشی خۆی خەریکی ئافراندن بوو، وەها هێزی داهێنەرانەکەی دەورووژاندەوە وا زەینە نەزۆکەکەی وردە وردە وەکار دەخستەوە، و دەستەواژە یان دیمەنێکی دەدیەوە کە ئەو کاتەی کڵاوی دەکردە سەر و دەهات بۆ دیتنی ژنە بە دوویدا دەگەڕا. هەر جانسۆنێك ترێلی"[١٤٨]" خۆی هەیە و لەبەر هۆیەکی وەك ئەمانەی بۆم گێڕانەوە، توند پێوەی دەنووسێ و کاتێ ترێل لەگەل مامۆستا ئیتالیایەکەی موسیقاکەی خۆی زەماوەند بکات، جانسۆن لە حەیبەت ڕق و نفرەت دەگاتە سەرحەددی شێتی نەك هەر لەبەر وەی دوانیوەڕۆ خۆشەکانی خۆی لە ئێستریتام"[١٤٩]" لە کیس دەچێ، بەڵکو لەو سۆنگەیەوە، کە ڕووناکایی ژیانی «دەڵێی دەکوژێتەوە."[١٥٠]"ڕەنگە بتوانین، بێ وەی خۆمان لە جیات دوکتور جانسۆن یان گوتێ و کارلایل و

---

148- Mrs. Hester Thrale
149- Streatham

١٥٠- خانمی هەستێر ترێل (١٨٢١-١٧٤١)بە هۆی میوانداریەکانیەوە، کە شوێنی کوڕ و کۆ بوونەوەکانی شاعیران و نووسەران بوو، بە ناوبانگ بوو و دوکتور سامۆئێل جانسۆن (٨٤-١٧٠٩)، نووسەر و قامووس نووسی ئینگلیسی و لە ڕووناکبیرانی گەورەی ئەو سەردەمە، هاوڕێی بنەماڵەی خانم و ئاغای ترێل بوو و لە ماڵە گەورەکەی ئەواندا ژوورێکی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەو دایمە تاریفی بەدەماخی و هۆش و لێهاتوویی خاتوو ترێلی دەکرد و چەند هۆنراوەیەکیشی بەسەردا هەڵگوت. پاش مەرگی هێنری ترێل، خاتوو ترێل کە ٤٣ ساڵە بوو عاشقی گابریەل پیوزێی ئیتالیایی، مامۆستای موسیقای کچەکەی بوو، و سەرباری پێ ناخۆش بوونی کچەکەی و دوکتور جانسۆن، ئاخری مێردی پێکرد و چووە ئیتالیا. دوکتور جانسۆن کە زۆری ڕق لە

وۆڵتێر دانێین، چیەتی ئەم ئاڵۆزی و هێزی ئەم گەشەکردنە گەورەی هێزی داهێنانە لە نێوان ژناندا هەست پێبکەین، هەر چەندە هەستی مە لەگەڵ هی ئەم کەڵە پیاوانە تەواو جیاوازە. بۆ وێنە، دەچینە دیوێك-بەڵام پێویستە کتێبەکانی زمانی ئینگلیزی نەرم ونیانییەکی زێتر لە خویان نیشان دەن، و کۆڵێك وشە بە شێوەیەکی ناشەرعی بێنە گۆڕێ تا ژنێك بتوانێ بڵێ ئەو دەمەی دەچێتە دیوێکەوە، چی ڕوودەدات. دیوەکان تەواو پێکەوە جیاوازن ئۆقرەیان تێدایە یان پڕن لە ئاژاوە ڕووەو زەریا یا بە پێچەوانە، ڕووەو حەوشی بەندیخانەن کە جلی شۆراویان تێدا هەڵخراوە، یان گەشن وگەوزاون لە ئاقیق و ئاورێشمدا، یان وەك تووکی ئەسپ زبرن یان وەك پەری قوورینگ نەرمن ئەوندەی دەوێت تاوەك بچنە هەر ژوورێکی لە هەر شەقامێکدا تا گشتی ئەو هێزە زۆر پێچەڵاً و پێچەی ژنایەتیتان لە پڕ وێکەوێت. مەگین دەکرێ شتێ بێجگە لەمە بێت؟ ژنان بە درێژایی ئەم میلیۆنان ساڵە لە ناو ماڵ دانیشتوون، تا ئەو جێگەیەی وا ئێستەکە ئیتر هێزە داهێنەرانەکەیان لە دیوارەکانەوە ڕۆچووە و، لە ڕاستیدا، تایبەتمەندیەکانی خشت و قوڕ و سیمانەکەیان وەها گۆڕیوە، کە بە ناچار دەبێت بەقەڵەم و فلچە و کار و سیاسەت، لەغاوی کەیت. بەڵام ئەم هێزە داهێنەرانەیە لەگەڵ هێزی داهێنەرانەی پیاوان زۆر جیاوازە. و دەبێ ئەوە بڵێی کە زۆر جێگەی داخە ئەگەر بەر بەم هێزە بگیردرێت یان بە فیڕۆ بچێت، چون بە بۆنەی چەندەها سەدە تەکووزی و ڕێکوپێکیەکی زۆرەوە پێکهاتووە، و جێگرێکی نییە. جێگەی داخێکی زۆرە ئەگەر ژنان وەك پیاوان بنووسن، یان وەك پیاوان بژین، یان بەرووالەت وەك پیاوان بن، چونکە ئەگەر ئەم دوو ڕەگەزە —بە لەبە چاو گرتنی بەربلاوی و جۆراوجۆری دونیا-تا ئەو ڕادەیە لێنەهاتوون، چلۆن دەتوانین هەر بە ڕەگەزێکەوە هەڵکەین؟ ئایا خوێندن و ڕاهێنان نابێ جیاوازیەکان و نەك وێکچوویەکان دیاری و بەهێز بکات؟ لەم بارودۆخەشدا لەڕادەبەدەر وێکدەچین، و ئەگەر دۆزەوەرێك بێتەوە و هەواڵی ڕەگەزگەلێکی ترمان بۆ بێنێ وا لە نێوان لق و پۆپێکی ترەوە چاو لە ئاسمانەکانی تر دەکەن، خزمەتێکی زۆر گەورەی بە مرۆڤایەتی کردووە، و ئێمە لەم نێوانەدا چاو لە پرۆفیسۆر ئیکس‌کردنمان زۆر پێخۆشە وا بەپەلە بەدووی هێڵ کێشی پێوانەکردنەکەیدا دەگەڕێ تا «مەزنایەتی»خۆمان پێ بسەلمێنێ.

هەر وا کە نەختێك لەو لای لاپەڕەکەوە دەسووڕامەوە، بیرم لەوە کردەوە مێری کارمایکێل هەر وەك بینەرێکی ڕووت کارێکی دژواری بەدەستەوە دەبێت. لە ڕاستیدا، دەترسم هەوا لەکەللەی بدات

---

شوو کردنەوەکەی خانمی ترێل هەستابوو، پێوەندیەکەی خۆی لەگەڵی پچڕی و تا کۆتایی ژیانی ئیتر نەیدیت و لێی نەبوورا. و-ف

و ببێتە ڕۆماننووسێکی سروشت خواز. -یانی جۆرێك لەو جۆرانەی وا بەڕای من زۆر سەرنجڕاکێش نابن- و نەك ڕۆماننووسێکی بیرمەند. کۆڵێك زانیاریی نوێ بۆ چاولێکردنی ئەو لەبەر دەستدایە. ئیتر پێویست ناکات خۆی بە ماڵە ڕووسوورانەکانی چینی ناوەڕاست بۆ سەرەوە ببەستێتەوە. بێ مێهرەبانی لەگەڵ کردن یا خۆبەزلزانین، بەڵکە بە هاوڕێیەتی کردن و هاودڵی، دەچێتە ئەو ژوورە چکۆلە و بۆن خۆشانەی وا دلدارەکان، سۆزانییەکان و خاتوونێك بە سەگێکی پاگ"[١٥١]"ەوە لەوێ دادەنیشن، بە جلکێکی نالەبار و بازاڕیەوە وا پیاوی نووسەر بە زۆری بە بەریدا کردوون. بەڵام مێری کارمایکێل مقەستەکەی خۆی دەردێنێ و ئەم جلانەیان بە ڕێکوپێکی بۆ دەبڕێ. و ئەگەر کاتی خۆی بێ، تا ژنان بەو جۆرەی کە هەن ببینین، چاومان بە دیمەنێکی سەیر دەکەوێت، بەڵام دەبێ تۆزێك سەبر کەین، چون هێشتاکەش دەست و لاقی مێری کارمایکێل بەستراوەتەوە بە هەمان هەستی حەپەساوی لە بەر دەم «گوناح»دا، وا میراتی دلڕەقی ڕەگەزیەکەمانە. هێشتاش قولڵف و قەڕازەی کۆن و بێبایەخی چینایەتی بە لاقیەوەیە.

بەڵام زۆربەی ژنان نە سۆزانین ونە دلدار و نەك گشت دوانیوەڕۆیەکی هاوین دادەنیشن و سەگی پاگ قایم بە جلە مەخمەرە خۆڵاویەکانیانەوە دەنێن، ئەی کەوابێ چی دەکەن؟ لەم کاتەدا، دانەیەك لەو شەقامە گەورانەی باشووری چۆمیم هاتە بەر چاو وا پیادەڕۆ دوور و درێژەکانیان زۆر قەرەباڵغە. لە خەیاڵدا، خاتوونێکی زۆر بەساڵا چووم دی وا قۆڵی لە ناو قۆڵی ژنێکی گەڕاوەدا بوو، ڕەنگە کچی بێ، لە شەقامەکەوە تێدەپەڕی هەر دووکیان وایان کڵاو و مێزەر لەسەر کردبوو، کە دیار بوو جل لەبەرکردنەکەیان هەموو دوانیوەڕویەك داب و نەریتێکی تایبەتی هەیە، و ئەم جلانە، هەموو ساڵێك لە هاویندا، بە کافوورەوە لە دۆڵابەکە دەخەن. و کاتی داگیرسانی چراکان بە شەقامدا تێدەپەڕن(چون کاتی ڕۆژ ئاوا بوونیان پێ خۆشە)، هەر بەوجۆرەی ڕەنگە گشت ئەم ساڵانە بە شەقامدا تێپەریبن. ژنە بە تەمەن ترەکە نزیکەی هەشتا ساڵ دەبێ، کەچی ئەگەر کەسێك لێی بپرسێ چی لە ژیان تێگەیشتووە، دەڵێ لە بیریەتی شەقامەکانیان بە بۆنەی شەڕی بالاکلاوا"[١٥٢]"بە چرا ڕازاندبووەوە، یان دەنگی هاویشتنی تۆپەکان لە هاید پارکی بە بۆنەی لەدایکبوونی شا

---

١٥١- سەگی پاگ (pag)، وا ڕەگەزەکەی چینیە، لە ساڵی١٦١٨١٨هێنرایە ئینگیس و وردە وردە کەوتە ناو دەرباریش و نەختە نەختە بووە مۆدی ڕۆژ تا وای لێهات لە سەدەی هەژدەیەمدا هەر ژنێکی دەوڵەمەندی بەمۆد سەگێکی پاگی پێبوو. بەمجۆرە، مەبەستی وۆڵف لە خاتوونێك بە سەگێکی پاگەوە دەبێ ژنێکی دەوڵەمەند و بە مۆد بێ. و. ف

152- Balaclava

ئیدواردی حەوتەمەوە بیستووە. و ئەگەر کەسێك بیهەوێ زەمانێك بە وردی ڕێکەوت و وەرزەوەکەی دیاری بکاتن، و لێی بپرسێ خۆتان لە پێنجەمی ئاوریلی ١٨٦٨ دا چیتان دەکرد، یان لە دوهەمی نوامبری ١٨٧٥، گێژ و سەر لێشێواو دەبێت و دەڵێ هیچی وەبیر نایات. چون گشت شیوی شەوەکان لێنراون قاپ و کەوچکەکان شۆراون منداڵان چوونەتە قوتابخانە و هەنگاویان ناوەتە دونیای دەرەوە. ئەو هەموە، هیچی لێنەماوەتەوە. گشتی شتەکان ون بوون. لە هیچ ژیاننامەیەك یان کتێبێکی مێژووییدا وشەیەك لەم بارەوە نەنووسراوە. و ڕۆمانەکان، بێ وەی هیچ ئامانجێك لە گۆڕێدا بێ، بە ناچار درۆ دەکەن.

وەك ئەوەی مێری کارمایکێل لەوێ بێ، پێم گوت، گشتی ئەم ژیانە زۆر نەناسراوانە دەبێ تۆمار بکرێن، و بە خەیاڵ لە شەقامەکانی لەندەن کەوتمە ڕێ. لە دونیای خەیاڵدا، هەستم بە گوشاری بێدەنگی دەکرد، و قەڵاچنکردنی ژیانە تۆمار نەکراوەکان، چ لە لایەن ژنانی قەراغ شەقام وا دەستیان لە کەلەکە نابوو و ئەنگوستیلەیان لە قامکە قەپەگۆڵەکانیان کردبوو و بە ناز و ئەدایەکەوە وەك ریتمی ڕستەکانی شێکسپیردەئاخاوتن چ لە لایەن ئەو ژنە گوڵ فرۆش و شقارتە فرۆش و دەڵەدێوانەی لە نێوانی نێودرگاکاندا ڕاوەستابوون و چ لە لایەن ئەو کچە سەرلێ شێواوانەی وا رووخساریان، وەك شەپۆلێك لە نێو هەور و هەتاودا، هەواڵی هاتنی پیاوان و ژنان و پتەپتکردنی چرای دوکانانیان دەهێنا. بە مێری کارمایکێلم وت، دەبێ مەشخەڵەکەت قایم بەدەستەوە بگری و هەموو ئەمانە بپشکنی. لەمانە گرینگتر، دەبێ ڕۆحی خۆشت بە گشت هەڵگەڕان و داگەڕانەکانییەوە، خۆبەزلزانین و گەورەیی کردنەکانییەوە، ڕوون بکەیتەوە و بڵێی جوانی و ساکاری بۆ خۆت بە چ واتایەکە، و پێوەندی تو لەگەڵ ئەو دونیایە لە چیدایە وا هەردەم دەگۆڕدرێ و خول دەخوات و هەردەم لە نێو ئەو دەسکێش و کەوش و شتانەیترەوە تێدەپەڕێ کە بە نێو بۆنی نەرم و هێدی بتڵی دەرمانخانە و کۆتاڵی بازاڕچەی جل و بەرگ و بەسەر کەفپۆشی بەردە مەڕمەڕدا بەم لا وئەو لادا دەڕۆن؟ ئێستەکە لە دونیای خەیاڵدا چووبوومە ناو دوکانێکەوە وا عەرزەکەی کەفپۆشی ڕەش و سپی لێدرابوو و جاخانەکەی بە شریتی ڕەنگاوڕەنگی زۆر جوان ڕازاندرابوەوە. لەبەر خۆمەوە وتم، بریا مێری کارمایکێل لە کاتی تێپەڕیندا چاوێکی لەم دیمەنە بکردایە، چون ئەویش ئەوندە بەکاری وەسفکردن دێ وا نوچکە کێوێکی پڕ لە بەفر یان دۆڵێکی بەردین لە کێوەکانی ئاند. هەروەها ئەو کچە فرۆشیارەی پشت مێزەکە —نووسینی کورتەمێژویەکی ڕاستەقینەی ژیانی بۆ من ئەوندە گرینگە وا نووسینی سەد و پەنجاهەمین ژیاننامەی ناپیلیۆن یا هەفتایەمین لێکۆڵینەوە

سەبارەت بە کیتس و کەڵك وەرگرتنی ئەو لە پێچەوانەکردنەوەی میلتۆنی"[153]"بۆ فلانە پرۆفسۆرە بەساڵاچووە و لەم وێنانە، وا ئێستەکە خەریکی کۆکردنەوەیانن. پاشان زۆر بە خۆپارێزیەوە و بە هێوری چوومە پێش (چون زۆر ترسەنۆکم، و لەو قەمچیە دەترسم وا خەریك بوو جارێکی وەبەر شانم کەوێت.) و سووك لەبنەوە وتم، ئەو دەبێ لە پەنایەوە فێر ئەوەش بێ کە بەبێ پێناخۆش بوون بەو خۆبەزلزانیانە، یان باشتر بڵێم، بەو تایبەتمەندیە سەیروسەمەرانەی ڕەگەزەکەیتر-ئەم دەستەواژەیە ماقووڵانەترە-پێبکەنێ. چون بە قەرا قەرە پوولێکی یەك شیلینگی دەبێ وا لە دواوەمانەوە قەتی نابینین. ئەمە یەکێ لەو خزمەتە باشانەیە وا ڕەگەزێك دەتوانێ بۆ ڕەگەزەکەی تری بکات. -یانی دەتوانێ ئەو خاڵەی بە قەرا قەرەپوڵە یەك شیلینگیەکەیە لە دواوەی مرۆڤ وەسف بکات. بیری لێ بکەنەوە کە ژنان چەندە لە ڕادەربڕینەکانی جۆونال"[154]"، لە ڕەخنەەی ئێستریندبێرگ"[155]" کەڵکیان وەرگرتووە. بیهێننە بەر چاوتان پیاوان بە چ لێهاتوویی و مرۆڤایەتیەکەوە لە سەرەتاییترین سەردەمەکانەوە ئەو خاڵە تاریکەی پشتە سەریان بە ژنان پیشان داوە! و ئەگەر مێری زۆر ئازا و ڕاستگۆ بێ، لە دواوەی جنسیەتەکەی تر رادەوەستێ و دەڵێ چی لەوێ دیتوەتەوە. تا ئەو دەمەی ژنێك ئەو خاڵەی بە قەرا قەرەپولە یەك شیلینگیەکەی وەسف نەکردبێ، قەت ناکرێ وێنەیەکی تەواوی پیاوان وینا بکەیت. ئاغای وودهاوس و ئاغای کازابۆن"[156]"خاڵگەلێکی ئەوندە و بە هەمان چیەتیەوەن. هەڵبەت هیچ کەسێکی عاقل لێی ڕاناسپێرێ بە عەنقەستە و بە مەبەستێکی تایبەتەوە خەریکی گاڵتەجاڕ پێکردن و پێ پێکەنین بێ. ئەدەبیات بێ کەڵکبوونی ئەو بەرهەمانەی بەو حاڵەوە نووسراون دەخاتە بەر چاو. دەڵێین ڕووڕاست بە، و ئاکامی کارەکە حەتمەن لەڕادەبەدەر سەرنجڕاکێش دەبێ. حەتمەن تەنزێکی بەهێزی لێ دەردێت. حەتمەن زانیاریگەلێکی تازە دەدۆزرێنەوە.

بەڵام ئیتر کاتی ئەوە هاتبوەوە دیسان چاو لە لاپەڕەکە کەمەوە. باشتر وابوو لە جیات ئەوەی بیر لەوە کەمەوە مێری کارمایکێل دەیتوانی چی بنووسێت یان دەبێ بنووسێت، چاو لێکەم بزانم لە ڕاستیدا مێری کارمایکێل چی نووسیوە. بۆیە دیسان دەستم کردەوە بە خوێندنەوە. لە بیرم هاتەوە هەندێ گلەییم لێی هەبوو. ئەو ڕستەی جین ئاستەنی لێك بڵاو کردبووەوە، و لە ئاکامدا ڕێگەی ئەوەی بە من نەدابوو پۆز بە سەلیقە ڕێکوپێك و تەواوەکەی خۆمەوە لێدەم. کەڵکێکی نەبوو، کە

153- Miltonic inversion
154- Juvenal
155- Strindberg
156- Casaubon

بڵێم: «بەڵێ، بەڵێ، ئەمە زۆر باشە، بەڵام جین ئاستەن زۆر باشتری لە تۆ دەنووسی، لە کاتێکدا دەبوو دانم بەوەدا بنایە، کە پەخشانەکەیان هیچ وەك یەك نەدەچوون. ئەوە پاشان هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە هەڵێنابوو و ڕێکوپێکی و بەدووی یەکداهاتنە پێ ڕاهاتووەکەی، تێکدابوو. ڕەنگە ئەم کارەی بە ناوشیاری کردبێ و، وەك هەموو ژنێك، هەر شتەکانی ڕێکوپێك کردبێ، هەڵبەتە ئەگەر وەك ژنانی بنووسیایە. بەڵام کاریگەرییەکە هێندەی تووشی سەر لێ شێواوی دەکردی کە نەدەکرا چاوت بە شەپۆلێك بکەوەێ وا وەڕێ دەکەوێ، یان ئەوەی کە خەریکە تەنگەژەیەك دێتە ئاراوە. کەواتە من نەمدەتوانی شانازی بکەم بە ئێحساساتە قووڵەکەم، یان بە تێگەیشتوویە قووڵەکەم لەمەڕ دەروونی مرۆڤەوە. چون هەر دەمێك کە بمویستایە هەست بە شتی ئاسایی بکەم لە شوێنە ئاساییەکان سەبارەت بە ئەوین، یان مردن، ئەو شتە موزاحیمە ڕێگەی پێدەگرتم، دەتگوت خاڵە گرینگەکە هەر تۆزێك لە پێشترەوە بوو. بەمجۆرە، ئەو ڕێگەی ئەوەی بە من نەدەدا دەستەواژە بە کەبکەبە و دەبدەبەکانی خۆم لەمەڕ«عەواتیفی ئاسایی»، «پرسە هاوبەشەکانی مرۆڤایەتی» و «قووڵایەکانی دەروونی مرۆڤ» بدرکێنم، و هەروەها گشت ئەو دەستەواژانەی تر وا بیر و باوەڕی مە پتەوتر دەکەن بڕوا بەوەی کە هەرچەندە بە ڕواڵەت زیرەك بین، لە ناخەوە زۆر شیلگیر و زۆر قووڵ و زۆر مرۆڤین. بە پێچەوانەوە، ئەو بووە هۆی ئەوە کە هەست بەوە بکەم لە جیات ئەوەی شێلگیر و قووڵ و مرۆڤ بی، هەر زەینێکی تەمبەل و شوێنکەوتووی داب و نەریتت هەبێ- و ئەم بیرۆکەیەش هێندە سەرنجڕاکێش نەبوو.

بەم حاڵەشەوە، درێژەم بە خوێندنەوەکەم دا، ولە ڕاستەقینەگەلێکی تر گەیشتم. ئەو «بلیمەت» نەبوو وەك ڕۆژ ڕوون بوو. لەو ئەوین بە سروشتە، ئەو هێزە خەیاڵە یاخیە، ئەو شاعیرایەتیە سەرکێشە، ئەو هۆشە زۆرە، ئەو زانستە قووڵەی پێشینیانە گەورەکەی خۆی-لێیدی وینچێلسی، شارلۆت برۆنتێ، ئیمێلی برۆنتێ، جین ئاستەن و جۆرج ئیلیۆت- بێبەش بوو. نەیدەتوانی وەك دوروتی ئازبۆرن خۆش و مەند بنووسێ-لە ڕاستیدا هەر کچێکی زیرەك بوو کە بێ گومان وەشانگاکە تا دە ساڵێکی تر کتێبەکانی وورد دەکردەوە. بەڵام، هەر چونێك بێ ئیمتیازگەلێکی تایبەتی هەبوو وا تەنانەت تا نیو سەدە لەمەوبەریش ژنانێکی زۆر لەو کارامەتر، لێی بێبەش بوون. پیاوان بۆ وی ئیتر «لایەنی بەرامبەر» نەبوون پێویست نەبوو کاتی خۆی بۆ بەگژا چوونی ئەوان بەفیڕۆ بدات و نەیدەویست بچێتە سەربان و ئارامشتی زەینی خۆی بە ئاواتی ئەوەی بچێتە سەفەر و ئەزموون کۆکاتەوە و دونیا و مرۆڤەکان بناسێ، تێکدا، کە لێی بێبەش کرابوو. ترس و نەفرەت نیسقاڵێکی لێ مابوو، یان شوێنەوارەکەیان تاقە وەك زێدەڕۆییکردنیکی کورت لەمەڕ

پێخۆش بوونی ئازادی، و داگەڕان بەرەو لای پەخشانێکی تاڵ و ڕەخناوی لە جیات پەخشانێکی ڕۆمانتیك لە کاتی ڕووبەڕۆو بوونەوە لەگەڵ ڕەگەزەکەی تردا دیار بوو. کەواتە، گومانێك لەوەدا نەبوو کە وەك ڕۆماننوسێك هەندێ ئیمتیازگەلی زۆر باشی ئاسایی پێدرابوو. هەستیاریەکی زۆر بەربلاو، زۆر قایم و ئازادی هەبوو وا کەم تا کورتێك بەرهەڵستی هەر وێك کەوتنێکی نادیار دەبووەوە. وەك گیایەك وا تازە کەوتبێتە ناو هەوایەکی ئازادوە، هەر دیمەن و دەنگێك لە لایەوە تێپەڕیایەن بە چاو چنۆکی قەپاڵی پێدا دەکرد. هەروەها زۆر بە جوانی و ئیشتیایەکی فرەوە بە نێو پرسگەلێکی کەم تا کورت نەناسراو یان تۆمار نەکراودا دەخولاوە و تیشکی دەخستە سەر پرسە بچووکەکان و ئایەنی دەکردەوە کە ڕەنگە هێندیش گچکە نەبن. و پرسگەلی شاراوە و خۆڵ بەسەرداکراوی ئاشکرا دەکرد و دەبووە هۆی ئەوەی لە خۆمان بپرسین چ پێویستێکی هەبووە ئەمانە بشاردرێنەوە و بکەونە بن عەرزی. هەر چەندە کار نەزان بوو و بێ بەهرە لەو میراتەی وا هەروا لە بنچینەیەکی دوور و درێژەوە بۆی بەجێ مابوو، کە دەبێتە هۆی ئەوەی چکۆلەترین وەرسووڕانی قەڵەمی تەکری یان لەمبت بە هەوایەکی خۆشەوە بێتە گوێ، ئاواش، بە ڕای من، یەکەمین وانە گەورەکە باش فێر ببوو وەك ژنێك نووسیبووی، بەڵام ئەو ژنەی وا ژن بوونی خۆی لە بیر چووەتەوە، و لە ئاکامدا لاپەڕەکانی کتێبەکەی پڕ بوون لەو چۆنییەتیە ڕەگەزیە سەیرەی وا هەر سەردەمانێکی دێتە ئاراوە کە ڕەگەز خۆی لە بیر چووەتەوە.

گشتی ئەمانە پۆزێتیو بوون. بەڵام وروژانی ئێحساسات یان جوان تێڕوانین بە هیچ چەشنێ کاریگەر نەدەبوو مەگین ئەوەی، کە ئەو بیتوانیایە لەو شتەی وا تاکەکەسی و کەم خایەن بوو باڵەخانەیەکی زۆر قایم ساز کات، کە بمێنێتەوە و دانەڕمێ. گوتبووم ڕادەوەستم تاوەکی خۆی بخاتە ناو «هەڵێکەوە» مەبەستم ئەوە بوو، کە ڕادەوەستم تا ئەو بە سەرنج پێدان، بە ئاماژە پێکردن و تێڕامان بیسەلمێنێ وا تێڕوانینێکی ڕووکەشانە و کەم خایەنی نییە، بەڵکە دەروون دەپشکنێ و چاو لە قووڵایەکان دەکاتن. لە ساتێکی دیاریکراودا بە خۆی دەڵێ، ئێستەکە کاتی ئەوە هاتووە بەبێ هیچ کارێکی ئازاردەر واتای هەموو ئەم شتانە بخەمە ڕوو. و دەست دەکا بە ئاماژەکردن و سەرنج پێدان (و ئەم گەشەکردنە خێرایە زۆر مسۆگەر و حاشا هەڵنەگرە!) و بابەتە زۆر و کەم لە بیرەوە چووەکان، یان ڕەنگە تەواو وەلا نراوەکان، کە لە بەشەکانی تردا لە پەڕاوێزدا هاتنە گۆڕێ. وەبیر دێنەوە. کارێکی وادەکات خوێنەر لە کاتی دروومان کردن یا سەبیلە کێشاندا، تا ئەو جێیەی دەکرێ بە شێوەیەکی ئاسایی هەست بە هەبوونیان بکات و لە هەمان کاتدا کە نووسەر بەرەو

پێشەوە دەچێت، هەست دەکەین دەڵێی لەسەر بانی دونیا ڕاوەستاوین و لەوێوە هەموو شتێك لەوپەڕی گەورەییدا لە بن پێی خۆمان دەبینین.

هەر چۆنێك بێ، ئەو خەریکی هەوڵ و تەقەلادان بوو. هەر بەو جۆرەی کە چاوم لەو دەکرد وا خۆی بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە تەیار دەکرد، ئۆسقۆفەکان، سەرۆکی زانکۆکان، پزیشکان و ئوستادان، باوك سالاران و مامۆستا توند و تیژەکانم دەدی بەڵام هیوام بەوە بوو، کە نەیانبینێت-وا هەموویان بە گوڕەگوڕەکەی خۆیان بارانێکی ئامۆژگاری و تێبینیان بەسەردا دەباراند. ناتوانی ئەم کارە بکەیت، نابێ بیکەی! هەر ئوستادان و پشکێنەران ئیجازەیان پێدراوە بەسەر ئەم چیمەنەدا بڕۆن! خانمەکان بێ پسوولە ئیزنی هاتنە ژوورەوەیان پێنەدراوە! ژنانی ڕۆماننووسی بەڕێز و بەدووی نێوکەوتوودا لەم لایەوە! ئابەمجۆرە، وەك جەماوەری پشت پەرژینەکانی گۆڕەپانی غارغارێنی ئەسپ، بەسەریاندا دەنەڕاند، و تاقیکردنەوەکەی ئەو ئەمە بوو بێ ئاوڕدانەوە بە لای ڕاست و چەپیدا بەسەر لەمپەرەکاندا باز بدات. پێم وت، ئەگەر ڕاوەستی و جنێو بدەی، کێ بەرکێیەکەت دۆڕاندووە هەروەها ئەگەر ڕاوەستی تا پێبکەنی. ئەگەر ڕاڕا بکەی یان بپەشۆکێی، ئیتر هیچت پێناکرێ. وەك بڵێی هەموو پوڵەکەم لەسەر ئەو دانابێ، لەبەری پاڕامەوە، «هەر بیر لە بازدان بکەوە! ئەو وەك باڵندەیەك بازی بەسەر لەمپەرەکەدا دا. بەڵام لەدوای ئەوەیان لەمپەرێکی تری لێ بوو و لەمپەرێکی تر. نەمدەزانی تاقەتی هەیە یان نا، چون هاندانەکان و هەراهەراکە مێشکی سەریان دەبرد. بەڵام ئەو ئەوپەڕی کۆششی خۆی کرد. بیرم کردەوە، کارەکەی مێری کارمایکێل هێندەش خراپ نییە لەچاو ئەوەی کە بلیمەت نییە، بەڵکو کیژێکی گومناوە وا یەکەمین ڕۆمانەکەی خۆی لە ژوورێکی بەکرێگیراودا دەنووسێ، بێ وەی کە لەو شتە باشانە-کات و پارە و ئاسوودەیی-شتێکی پێ بڕابێ.

بەشی کۆتایەکەیم کە دەخوێندەوە، لەبەر خومەوە وتم سەت ساڵێتری دەرفەت دەنێ-لووت و سەرشانی ڕووتی خەڵکی لەبن ئاسمانی پڕ ئەستێرەدا وەدیار کەوتن، چون کەسێك پەردەی ژووری دانیشتنەکەی لادابوو-ژوورێك و ساڵی پێنسەد پاوەندی بۆخۆی بدەنێ، ڕێگەی بدەنێ هەر چیەك لە زەینی دایە بیخاتە سەر زار و نیوەی ئەو شتانەی وا ئێستەکە دەیاننووسێ وەلا نێن، ئەو دەم یەکێ لەم ڕۆژانە کتێبێکی باشتر دەنووسێ. ئەو دەمەی کتێبی بەسەرهاتی ژیان، نوسراوەی مێری کارمایکێلم دەخستەوە ئاخری قەفەسەکە، لەبەر خۆمەوە وتم، سەد ساڵی تر دەبێتە شاعیر.

# بەشی شەشەم

ڕۆژەکەی دواتر، ئەستوونی ڕووناکایی ئاوێتە لەگەڵ تۆزی بەرەبەیانی ئۆکتۆبەر لە پەنجەرەکانەوە، وا پەردەکانیان لا درابوو، هاتبووە ژوورەکەوە، و دەنگە دەنگی هاتوچۆی سەر شەقام دەگەیشتە ژووری. لەندەن خەریك بوو دیسان خۆی تەیار دەکردەوە کارخانە پڕ ببوو لە جم و جۆڵ، و ماشێنەکان کەوتبوونە کار. هەوای ئەوە لە کەللەی دەدای لە پاش ئەو هەمووە کتێب خوێندنەوەیە لە پەنجەرەکەوە چاو لە دەرێ کەیت و بزانی لەندەن لە بەیانی ڕۆژی بیست و شەشەمی ئۆکتوبری ١٩٢٨دا خەریکی چیە. بە ڕاست لەندەن خەریکی چ کارێك بوو؟ وادیار بوو کەس ئانتونی و کلۆئێ پاترای نەدەخوێندەوە. لەوە دەچوو لەندەن بە گشتی گوێی بە شانونامەکانی شێکسپیر نەدەبزووت. کەس چکۆلەترین گرینگایەتیەکی بە داهاتووی چیرۆك نەدەدا، یان بو مەرگی شیعر، یان سەرهەڵدانی شێوازێکی پەخشانی ژنانی ئاسایی وا بتوانێ ئەوەی بە زەینیاندا تێدەپەڕێ بە گشتی بیدرکێنێ - و لەم ڕووەوە ڕەخنەیەکیان لێ ناگرم. ئەگەر بیروڕایەك سەبارەت بەم پرسانە بە گەچ لەسەر پیادەرەوەکە بنووسرایە، کەس ڕانەدەوەستا تا بیانخوێنێتەوە و کەمتەرخەمی لاقە بەپەلەکانیان بە نیو کاتژمێر دەیسڕینەوە. ساتێك کوڕێکی کرێکار دەڕۆیشت ساتەکەی دواتر ژنێك وا کاڵانی سەگێکی بە دەستەوە بوو. جوانی سەرنجڕاکێشی شەقامەکانی لەندەن لەوەدایە وا قەت دوو ڕێبواری لەیەك ناچن دەڵێی هەر کەسەو خەریکی کاری خۆیەتی. کارمەندەکان بە جانتا بچووکەکانیانەوە مرۆڤگەلی سەرلێشێواو وا بە دار لە پەرژینی دەوراندەوری ماڵەکان دەگوتن کەسایەتیە خوێنشیرینەکان وا شەقامیان پێ وەك یاریگا و گاستین وایە و سلاو لەو کەسانە دەکەن وا سواری کالیسکە بوون و ڕێنوێنیان دەکەن بێ وەی کەسێك شتێکی لێ پرسیبێتن. هەر وەها مراسیمی ناشتنی تەرم وا لەناکاو پیاوان وەبیر مردنی خۆیان دەخاتەوە و وایان لێ دەکات کلاوەکەیان لەسەر سەریان لابەن. وە پاشان پیاوێکی مەند هێور لە پلیکانەکانی بەر درگای ماڵێکەوە دێتە خوار و ڕادەوەستێ تا لەو خانمە هەیەجاناویە نەکەوێت، کە بە جورێکی باڵتەیەکی تووکی زۆر جوان و چەپکێ وەنەوشەی وەدەست هێناوە. بەڕواڵەت هەموویان لە یەکتری جیاواز بوون، نوقمی خۆیان بوون، وەدووی کار و ژیانی خۆیانەوە.

لەم ساتەدا، هەر وەك بەوجۆرەی زۆر جاران لە لەندەن هەڵدەکەویٚ، هاتوچۆ بە گشتی نەما و هەموو شتێك دواکەوت. هیچ کەرەسەیەکی گواستنەوە بە شەقامدا تێنەدەپەڕی کەس لە هاتوچۆدا نەبوو. گەڵایەك خۆی لە دار چنارەکەی قەراغ شەقام لێکردەوە و لەو بێدەنگی و ڕاوەستایەدا کەوتە عەرزی. دەتگوت نیشانەیەك کەوتبووە سەر عەرزی، هێمایەك وا ئاماژەی بە هێزێك دەکرد کە هیچ سەرنجێکت نەدابوویێ. دەتکوت ئاماژەی بە ڕەوتی ڕووبارێکی نادیار دەکرد وا لەهۆ ئەو سوچەوە دەگەڕاوە و بە شەقامدا سەرەوخوار دەبووەوە و مرۆڤەکانی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت و دەیبردن، هەر بەوجۆرەی ڕووبارە چکۆلەکەی ئاکسبریج گەڵا وشکەکان و خوێندکارەکەی سەر گەمیەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد. ئێستەکە خەریك بوو ئەو کیژەی وا چەکمەی بریقەداری لە پێدا بوو لە ڕێگەیەکی لارەوە لەوبەری شەقامەوە بۆ ئەم بری تری دێنا، و پاش ئەو پیاوێکی لاو وا باڵتەیەکی ڕەنگ خورمایی لەبەردا بوو، تاکسیەکیشی لەگەڵ خۆی دێنا. هەر سێکیانی ڕاست هێنایە سەر خاڵێکی بەر پەنجەرەکەی من. تاکسیەکە ڕاوەستا کیژ و پیاوە گەنجەکەش ڕاوەستان، و سواری تاکسیەکە بوون وە پاشان تاکسیەکە بە هێوری و خاوی ڕۆیشت، دەتگوت گەریانی ئاوەکە ئەو بەرەو لایەکی تر دەبات.

دیمەنێکی زۆر ئاسایی بوو ئەو شتەی سەیر بوو ڕێك وپێکیەکی ریتماوی بوو وا خەیاڵی من پێی بەخشیبوو و ئەم ڕاستەقینەیە کە دیمەنێکی ئاسایی سواری تاکسی بوونی دوو کەس هێزی ڕاگوێزانی شتێکی بوو وا قایل بوونی ڕاشکاوانەی ئەو دوو کەسەی دەدرکاند. هەر وا کە چاوم لە تاکسیەکە دەکرد کە بایداوە و لەبەر چاوان ون بوو، بیرم کردەوە، دیمەنی دوو کەس وا لە شەقامی خوارەوە دێن و لە سووچێکدا بەیەك دەگەن دەڵێی گوشارێك لەسەر زەین لادەبات. ڕەنگە بیر کردنەوە سەبارەت بە ڕەگەزێك بەو شێوە دابڕاو و جیاوازە لە ڕەگەزەکەی تر، هەروا کە لەم دوو ڕۆژەی دواییدا بیرم لیٚ کردبووەوە، و هەوڵدانی دەویست. ڕەنگە یەکپارچەیی زەینی تێکدەدا. ئێستەکە بە دیتنی دوو کەس وا بەیەك گەیشتبوون و سواری تاکسی ببوون، ئەو هەوڵە ڕاوەستاوە و ئەو یەکپارچەییە جارێکی تر هاتبوە دی. سەرم لە پەنجەرەکەوە هێناوە ژووریٚ و لەبەر خۆمەوە گوتم، زەینی ئینسان بەڕاستی زۆر ڕەمزاویە، و ئێمە هەرچەندە تەواو پێوەی بەندین، کەچی شتێکی وای لەبارەوە نازانین. بۆ چی من هەست ئەکەم، کە لە زەینیشدا هێزگەلێکی دژ و جیاواز کار دەکەن، هەروا کە گوشارگەلێك بە هۆی ڕوونەوە دەکەونە سەر جەستە؟ لەخۆمم پرسی، مەبەست لە «یەکپارچەیی زەین» چیە، لەبەر وەی بە دڵنیاییەوە زەین هێزێکی زۆری بۆ تێڕامان لەسەر هەر بابەتێك لە هەر ساتێکدا هەیە، تا ئەوندەی وا دێتە بەر چاو بوونێکی تاقانەی نەبیٚ. بۆ وێنە، زەین

دەتوانێ خۆی لە خەڵکی سەر شەقام جیا کاتەوە خۆی بەجیا لەوان، لە پەنا پەنجەرەیەك لە نهۆمی سەرەوە، بهێنێتە بەر چاو و لە سەرێوە چاویان لێکات. یان دەتوانێ لە خۆوە لەگەڵ خەڵکانیتر بیر بکاتەوە، وەك بڵێی لە نێو جەماوەرێکدا چاوەڕوانی بیستنی هەواڵێك بێ وا بڕیارە بخوێندرێتەوە. دەتوانێ لە ڕێگەی دایك و باوکانییەوە بیر لە ڕابردوو بکاتەوە. هەر وەها کە پێشتریش باسم کرد ژن لە کاتی نووسیندا لە ڕێگەی دایکەکانیەوە بیر دەکاتەوە. هەر وەها ئەگەر ژن بن، زۆر جاران جیاکردنەوەی لە کوتوپڕی ئاگاداریتان پێ سەیر دەبێ، بۆ وێنە کاتی پیاسەکردن لە وایت لە جیات ئەوەی کە خۆتان بە میراتگری ئاسایی ئەو شارستانییەتە بزانن، ڕاست بە پێچەوانە، خۆتان لە دەرەوەی ئەو، نامۆ و لە مەقامی ڕەخنە لێگرتندا دەبینن. بێ گومان زەین بەردەوام ناوەندی تێڕامانی خۆی دەگۆڕێ و جیهان لە کەلێن و کولێنی جیا جیاوە دەبینێ. بەڵام هەندێك لەم زەینییەتانە، تەنانەت ئەگەر بێ پێشەکی و هەڵقولاویش بن، لە هەندێکی تر دژوارتر دێنە بەرچاو. بۆ وەی کە بتوانین درێژە بە تێفکرین بەو زەینییەتەوە بدەین، بەبێ ئاگا لە خۆ بوون شتێك شاراوە دەهێڵینەوە، و ئەم سەرکوتکردنە وردە وردە پێویستی بە هەوڵ و تەقەلا دەبێ. بەڵام ڕەنگە زەینییەتێکی تر هەبێت کە پێویستی بە هەوڵ و تەقەلا نەبێت، چون پێویست ناکات کە شتێك بە شاراوەیی بهێڵینەوە. بەدەم ئەوەی کە خۆم لە پەنجەرەکە دوور دەخستەوە، بیرم کردەوە، وە ئەمە ڕەنگە یەکێك لەوانە بێ. چونکە کاتێ ئەو جوتەم دیت سواری تاکسی بوون، بە دڵنیاییەوە زەینم هەستی بەوە کرد، کە دەڵێی لە پاش لەت بوون جارێکی تر یەکپارچەیی ئاسایی خۆی دۆزیوەتەوە. ڕوونە وا دوو ڕەگەزەکە دەبێ پێکەوە بەشداری و هاریکاریی بکەن. لە ئینساندا غەریزەیەکی قووڵ، هەر چەندە نامەنتقی، بە قازانجی ئەو بیرۆکەیە هەیە وا یەکگرتنی ژن و پیاو زۆرترین ڕەزامەندی و تەواوترین شادومانی پێك دەهێنێ. بەڵام دیمەنی ئەو دوو کەسەی وا سواری تاکسی دەبوون، و ئەو ڕەزامەندیەی ئەو دیمەنە لە منیدا بەدی دەهێنا، ئەم پرسیارەی لە زەینی مندا دەهێنا گۆڕێ کە ئایا لە زەیندا دوو ڕەگەز هەن کە لەگەڵ ئەم دوو ڕەگەزە فیزیکیە یەکسان بێت، و ئایا ئەو دوو ڕەگەزەش دەبێ بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی و دڵخۆشی تەواو یەك بگرن. خەریکی کێشانەوەی نەقشەیەکی ناشارەزایانە لە ڕۆح بووم کە بەو پێیە بەسەر هەر کامێکمانەوە دوو هێز دەسەڵاتدارە، یەکیان نێر و یەکیان مێ لە مێشکی پیاودا، پیاو بەسەر ژندا زاڵە و لە مێشکی ژندا ژن بەسەر پیاودا. بارودۆخی ئاسایی و ئاسودەیی زەین کاتێك پێك دێ کە ئەم دوانە بە هاودەنگی پێکەوە

157- Whitehall

بژین و لەباری ڕۆحییەوە پێکەوە هاریکارییان هەبێت. ئەگەر پیاو بن، بەشی ژنانەی مێشك هەروا دەبێ کاریگەی هەبێت ژنیش دەبێ لەگەڵ پیاوی ناخی خۆی پێوەندیی هەبێت. ڕەنگە مەبەستی کۆلریج"[158]"لەم قسەیەی وا زەینی گەورە دوو ڕەگەزیە، هەر ئەمە بووبێ. پاش بەدیهاتنی ئەم یەکپارچەییەیە وا زەین تەواو بەتوانا دەبێ و بەر دەگرێ و گشت هێزەکانی خۆی دەخاتە گەڕ. لەبەر خۆمەوە وتم، ڕەنگە زەینێك کە هەر تاقە پیاوانە بێ، یان هەر تاقە ژنانە، نەتوانێ داهێنەر بێ. بەڵام خەرا نەبوو تێبفکریایەم و بە چوونە لای یەك دوو کتێب مەبەستی خۆم لە پیاوانە- ژنانە، یان بە پێچەوانە ژنانە-پیاوانە، مەحەك بکردایە.

بەدڵنیاییەوە مەبەستی کۆلریج لەم قسەیەی زەینی گەورە دوو ڕەگەزیە ئەمە نەبووە کە زەینێکی ئاوا خەمێکی تایبەتی بۆ ژنان دەخوات و بەرگری لە مافەکانیان دەکات، یان خۆی تەرخان دەکات بۆ شرۆڤەکردنی وان لە جیهان. ڕەنگە زەینی دوو ڕەگەزی کەمتر لە زەینی تاك ڕەگەزی بە ئاوەها جیاوازیگەلێك مل بدات. ڕەنگە مەبەستی ئەو ئەمە بوو، کە زەینی دوو ڕەگەزی دەنگەکە زیاتر هەڵدێنێ و چاتر ڕۆدەچێتە ناوەوە، ئێحساسات بێ لەمپەر ڕادەگوێزێت ئاساییە داهێنەر، بەنەشە و ڕێکوپێکە. لێرادا، جارێکیتر دەگەڕێینەوە لای شێکسپیر و زەینی ئەو وەك زەینێکی دوو جنسی لەبەر چاو دەگرین، لە جۆری زەینی پیاوانە- ژنانە، هەر چەندە مەحاڵە بتوانین بڵێین شێکسپیر چلۆنی سەبارەت بە ژنان بیر دەکردەوە. و ئەگەر ئەم بابەتە ڕاستی بێ وا یەکێك لە نیشانەکانی زەینی تەواو پوخت و پاراو ئەوەیە، کە بە شێوەیەکی تایبەتی یان جیاواز بیر لە ڕەگەز ناکاتەوە، دابینکردنی هەلومەرجێکی وا لە هەنووکەدا زۆر دژوارترە لە هەر کاتێکی تر. لەم کاتەدا، گەیشتمە کتێبەکانی نووسەرانی هاوسەردەم، و ڕاوەستام و لە خۆمم پرسی ئایا ئەم ڕاستەقینەیە سەرچاوەی هەر هەمان شت نییە وا ماوەیەکی زۆر سەری لە من شێواندبوو. هیچ سەردەمێك بە قەرا سەردەمانی ئێمە تا ئەو ڕادەیە ئاگادار لە جنسیەت نەبووە ئەو هەمووە کتێبە سەبارەت بە ژنان بە قەڵەمی پیاوان لە پەرتوکخانەی مۆزەی بەریتانیا پیشاندەری ئەم ڕاستەقینەیە. بێ گومان خەتای بزووتنەوەی مافی دەنگدانی ژنانە. حەتمەن مەیلێکی سەیر و سەمەرەی لە پیاواندا بۆ سەلماندنی خۆیان ساز کردووە. حەتمەن ناچاری کردوون پێداگری لە ڕەگەزی خۆیان و تایبەتمەندیەکانیان کەن، لە کاتێکدا ئەگەر ئەم پیاوانەیان بۆ بەربەرەکانێ بانگهێشتن نەکردایە، ئەوان زەحمەتی بیر کردنەوە لەمەڕ ئەم پرسانەیان نەدەدا بەر خۆیان. کاتێ کەسێك بۆ

---

158- Samuel Taylor Coleridge

بەربەرەکانیّ بانگ دەکەن، تەنانەت ئەگەر لایەنی بەرامبەریان چەند ژنێك بە کڵاوی ڕەشەوە بێت، زۆر و کەم چاك تۆڵە دەسێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەر لەوە قەت بۆ بەربەرەکانیّ بانگهێشتیان نەکردبیّ. دەستم دا ڕۆمانێکی تازە لە قەفەسەکەدا، نووسراوەی ئاغای "ئا" بوو وا لە لوتکەی بزووتنەوەی پیشەییدایە و ڕەخنەگران بە ڕواڵەت بەسەریدا هەڵدەڵێن. و بیرم کردەوە، ڕەنگە ئەم بابەتە پاساوێك بیّ بۆ هەندێك لەم تایبەتمەندیانەی وا لێرەدا دیومەتەوە. ڕۆمانەکەم هەڵداوە. ڕاستیتان دەویّ پێم خۆش بوو، کە جارێکی تر نووسراوەی پیاوێکم دەخوێندەوە. لە چاو بەرهەمەکانی ژنان زۆر ڕاشکاوانە و ڕوون بوو. پیشاندەری سەربەخۆیی فیکری، ئازادیی تاك و بڕوا بەخۆبوونێکی فرە بوو. لە بەرامبەر ئەم زەینە سەربەخۆیەدا، وا باشی پێڕاگەیشتبوون و باش خوێندەوار ببوو، و قەت کەند و کۆسپێکی نەکەوتبوە سەر ڕیّ، بەڵکە هەر لەسەرەتای لە دایکبوونییەوە ئازادیەکی تەواوی هەبوو تا بە هەر ئاراستەیەکی پێی خۆش بوو پەرە بە خۆی بدات، هەستێکی بریتی لە کامەرانی دەکەوتە گیانتەوە. گشت ئەمانە بۆ پێداهەڵگوتن دەبوو. بەڵام پاش ئەوەی کە یەك دوو بەشم خوێندەوە، دەتوت سێبەرێك کەوتە سەر لاپەڕەی کتێبەکە. سێبەرێکی ڕەش و رێك و ڕاست بوو، کەم تاکورت وەك پیتی«ا». سەرت بەم لا و ئەو لای سێبەرەکەدا دەکرد تا وەك بتوانی چاوێکت بە دیمەنەکەی ئەوبەریەوە بکەوێت. دڵنیا نەبووم ئەوەی دەمدی دارە، یان ژنێکە وا خەریکە بە ڕێدا دەڕوات. و هەموو کات دیسان دەگەڕامەوە لای پیتی«ا». ئیتر وردە وردە لەم پیتی «ا»یە وەڕەز دەبووم. هەڵبەتە ئەم «ا»زۆر جێگەی ڕێز بوو، شەریف بوو و مەنتەقی، و ڕەق وەك گاشەبەرد، و چەندەها لە سایەسەری ڕاهێنان و پەروەردەکردن و پێڕاگەیشتنی باش بریقەی درابوو. من لە قووڵایی دڵمەوە بارەقەڵڵایی بەم «ا»یە دەڵێم و ڕێزی لیّ دەگرم. بەڵام-لەم کاتەدا، بە دووی شتێکدا یەك دوو لاپەڕەم هەڵداوە — قەیرانە گەورەکە لەوەدایە لە بن سێبەری ئەم پیتی «ا»یەدا هەموو شتێك وەك مژ نادیارە. ئەوە دارێکە؟ نا، ژنێکە. بەڵام... هەر وا کە چاوم لە فیبی"١٥٩" نێوەکەی هەر ئەمە بوو- دەکرد وا لە کەناری زەریاوە دەهاتەوە، بیرم کردەوە کە ئەو بیّ ئێسکە. پاشان ئالێن وەدیار کەوت و سێبەری ئالێن دەستبەجیّ فیبی لەبەر چاو لابرد. چونکە ئالێن بیروڕاگەلێکی هەبوو فیبی نوقمی دەریای بیروڕاکانی بوو. پاشان بیرم کردەوە، کە ئالێن خواست و ویستێکی توندی هەیە. لەم کاتەدا هەستم دەکرد قەیرانەکە دێتە بەرەوە و لاپەڕەکانی کتێبەکەم خێرا خێرا هەڵدەداوە هەرواش بوو. لە کەنار

159- Phoebe

لەبەر هەتاودا ڕوویدا. تەواو ئاشکرا. بە گوڕ وتینێکی زۆرەوە. دزێوتر لەمە نەدەبوو. بەڵام... چەندەم «بەڵام» بەکار هێنابوو! مرۆڤ ناتوانێ یەکڕیز بڵێ: «بەڵام». نەڕاندم بەسەر خۆمدا کە دەبێ بە چەشنێك ڕستەکەت تەواو کەیت. ڕستەکە تەواو کەم؟ «بەڵام-تاقەتم نەماوە! بەڵام بۆ چی تاقەتم نەمابوو، تا ڕادەیەك لەبەر دەسەڵاتی پیتی «I» وا، وەك ئەو دار عەزیمەی راش، هەر چیەك کەوتبێتە بن سێبەرەکەی وشك و بێبەری دەکات. هێچ شتێك لەو بن نیسێەیەدا گەشە ناکات و تا ڕادەیەکیش لەبەر هۆگەلی لێڵی دیکە. وادیار بوو کەندوکۆسپی تر لە زەینی ئاغای ئادا بوو وا ڕێگەی کانی داهێنانی گرتبوو و بەستبوویەوە بە کەشێکی سنووردارەوە. میوانداری نیوەڕۆی لە ئاکسبریج، و خۆڵی جگەرە و پشیلە کلك قرتاوەکە و تنیسۆن و کریستینیا ڕۆزێتی، هەموویانم بەیەکەوە هاتەوە بیر ڕەنگە کەندوکۆسپەکە لەوێدا بوو. چون کاتێ فیبی لە کەنار دەگەڕێتەوە، ئالێن ئیتر لەبنەوە ناڵێ: «لەگوڵە ساعەتیەکەی بەر دەروازەکەوە دڵۆپە فرمێسکێکی بە شکۆ کەوتە خوار» و ئەو کاتەی ئالێن دێتە بەرەوە، فیبی لە وەڵامدا ناڵێ: «دڵی من چەشنی باڵندەیەکی گۆرانی بێژە وا لە نەمامێکی تازە ئاودراودا هێلانەی کردووە.» باشە، پیاو دەبێ چی بکات؟ چون ئەو وەك ڕۆژی ڕوونە و وەك هەتاو بەمەنتقە، تاقە کارێك دەتوانێ بکات و لە حەق لا نەدەین، ئەم کارە چەندەها و چەندەها(لاپەڕەکانی کتێبەکەم هەڵدەداوەوە و دووپاتم دەکردەوە) و چەندەها جار دەیکات. و، هەر چەندە ئاگادار بووم لە سروشتی ترسناکی دان پێدانان، پێم زیاد کرد، دەڵێی ئەم کارە بە جۆرێك وەڕەزکەرە. پڕکێشیکردنی شێکسپیر هەزاران شتی تر لە زەیندا سەراوبن دەکاتەوە، و قەتیش وەڕەزت ناکات. بەڵام شێکسپیر ئەم کارە بۆ پێخۆش بوونی دەکات و ئاغای ئا ئەم کارە، وەکی دەڵێن، بە ئانقەستە دەکات. ئەو ئەم کارە بە نیازی دەنگ هەڵبڕین دەکات. ئەو بە جەخت کردنەوە لەسەر مەزنایەتی ڕەگەزی خۆی، دەنگ لەهەمبەر یەکسانی ڕەگەزەکەی تر هەڵدەبڕێت و لە ئاکامدا، زەینی بەسەر لەمپەردا دەکەوێت و تووڕە و ڕق هەستاوە ئەگەر شێکسپیریش خاتوو کلۆ"[١٦٠]"و خاتوو دەیویسی بناسیایە، ڕەنگە ئەویش هەر ئاوا بوایە. بێ گومان ئەگەر بزووتنەوەی ژنان لە سەدەی شازدەیەمدا دەستی پێبکردایە، و نەك لە سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەدەبیاتی سەردەمی ئیلیزابێت لەگەڵ ئەوەی وا ئەمڕۆ هەیە زۆر جیاواز دەبوو.

---

١٦٠- (١٨٩٢١٨٩٢-١٨٣٠)، یەکەم سەرۆکی کۆلێژی کچانەی نیوهام لە کەمبریج-و. ف
Anne Jemima Clough

کەواتە ئەگەر ئەم بیرۆکەیەی دوو پاڵوو بوونەی زەین وەڕاست گەڕێ، ئەو شتەی دەکرێ لێی هەڵێنجی ئەوەیە وا پیاوەتی ئێستەکە خۆی ناسیوە-یانی پیاوان ئێستەکە هەر بە لای پیاوانەی مێشکیان دەنووسن. ژن بە هەڵەدا دەچێ ئەگەر نووسراوەکانیان بخوێنێتەوە، چونکە ژن بەناچاری بە دووی شتێکا دەگەڕێ کە لەواندا نایبینێتەوە. کتێبی ئاغای "ب" ڕەخنەگرم بەدەستەوە گرت و بە سەرنج و ئەرك ناسیەکی زۆرەوە خەریکی خوێندنەوەی بیروڕاکانی لەمەڕ هونەری شیعرەوە بووم، و بیرم کردەوە ئەو شتەی وا نەبوونەکەی لە نووسراوەکانی پیاواندا پتر لە هەر شتێکی تر هەستی پێدەکرێت هێزی پێ قەبووڵاندنە. بیروڕاکانی ئاغای ب زۆر بەجێ و هۆشیارانە و حەکیمانە بوو، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو کە هەستەکانی تری پێوەندیان ساز نەدەکرد دەتگوت زەینی ئەو ببووە بەشگەلێکی جیاواز و هیچ دەنگێك لە بەشێکەوە نەدەگەیشتە بەشەکەی تر. بۆیە، کاتێك لە زەینماندا دەچینەوە بە ڕستەیەکی ئاغای "ب" دا، هەر لەوێ بەبێ ڕۆحی دەکەوێت بە عەرزیدا بەڵام کاتێك ڕستەیەکی ئاغای کولریج دێتەوە ناو زەین، دەتەقێ و جۆرەکانی تری بیروڕا دەهێنێ و ئەمە تاقە جۆری نووسینە وا دەکرێ بڵێی ڕەمزی ژیانی هەرمانی تێدایە.

بەڵام ئەم ڕاستەقینەیە، بە هەر هۆیەکی بێت، جێگەی داخە. چون بەم واتایەیە- ئێستەکە گەیشتبوومە ڕیزی کتێبەکانی ئاغای گالزورتی"[١٦١]" و ئاغای کیپلینگ"[١٦٢]"-وا هەندێك لە باشترین بەرهەمەکانی کەڵە نووسەرانی سەردەمی ئێمە هیچ ئاوڕێکیان لێ نادرێتەوە. ژن هەر چیەك بکات ناتوانێ ئەو کانییەی ژینی هەرمانەی، وا ڕەخنەگران خاتری جەم دەکەن، کە لەو کتێبانەدایە، بدۆزێتەوە. ئەم کتێبانە ڕێز لە گەورەیی پیاوان دەگرن، بایەخەکانی پیاوان پەسن دەکەن و وەسفی دونیای پیاوان دەکەن جگە لەمانە، ژن لەو هەستەی زاڵە بەسەر ئەم کتێبانەدا ناگات. هێشتا زۆری ماوە بگەینە کۆتایی کتێبەکە، بە خۆمان دەڵێین ئێستەکە دێت، ئێستەکە گرد و کۆ دەبێت ئێستەکە بە سەرماندا دەڕووخێت. ئەو وێنەیە بە سەر سەری جولیانی پیردا دەکەوێت ئەو لە ترسان دەمرێت بەرێوەبەری نووسینگە لەبەر وەفاتی ئەو دوو سێ وشە قسە دەکات و گشت قورینگەکانی چەمی تێیمز بە یەکەوە دەست دەکەن بە خوێندن، بەڵام بەر لەوەی کە ئەم ڕووداوە ڕوو بدات، هەڵدێین و لە بن چڵە ترێ فەرەنگیەکاندا خۆمان دەشارینەوە، چون ئەو هەستەی ئەوندە بۆ پیاو قووڵ، ئەوندە ناسك، و ئەوندە سەمبولیکە، ژن کاس دەکات. ئەم ڕووداوە بۆ ئەفسەرانی ئاغای کیپلینگیش ڕوو دەدات وا خۆیان لە ئەرکەکانی سەر شانیان دەبوێرن و لەمەڕ

161- John Galsworthy
162- Rudyard Kipling

توو داچێنەکانی وا تۆو دادەچێنن و لە بارەی پیاوەکانی ئەوەوە وا لەگەڵ «کار»ەکەیان و لەگەڵ«ئالا »بە تەنیان-مرۆڤ بە هێنانە بەر چاوی ئەم دیمەنانە سوور هەڵدەگەڕێت، وەك بڵێی لەکاتی بەدزیەوە گوێداندا لە دانیشتنێکی تەواو پیاوانەدا پێیان زانیبێت. ئەوەی ڕاستی بێ نە ئاغای گالزورتی و نە ئاغای کیپلینگ بە قەرا نووکە دەرزیەك ژنایەتیان تێدا نییە. کەواتە، ئەگەر بتوانین گشت تایبەتمەندیەکانی ئەوان گشتگیر بکەین، خاو و کاڵ دێتە بەر چاوی ژن. هێزی پێ قەبووڵاندنیان تێدا نییە و کاتێ کتێبێك ئەو هێزەی تێدا نەبێ، هەر چەندەش بە قورسی بکەوێ بەسەر زەیندا، ناتوانێ لە ناخیەوە ڕۆچێ.

لەو حاڵی بێ ئۆقرەییەیدا وا کتێبەکان لەناو قەفەسەکە هەڵدەگرین و بێ ئەوەی کە چاوێکیان لێ کەین دیسانەوە دەیانخەینەوە سەر جێگاکەیان، دەستم کرد بەهێنانە بەرچاوی سەردەمانێك لە داهاتوویەکی نزیکدا-سەردەمی پیاوەتی پشت ئەستوور بە خۆیەکی بێوێنە وا نامەکانی ئوستادان (بۆ وێنە، نامەکانی سێر والتێر رالی"[١٦٣]")بە ڕواڵەت باسی لێ دەکات، و دەسەڵاتدارانی ئیتالیاش ئێستەکە هێناویانەتە دی. مەحاڵە ئەو هەستی پیاوەتیە تەواو و بێ وێنەیەی وا لە ڕۆم هەیە کاریگەری بەسەر کەسەوە نەبێ هەر چەندەش پیاوەتی تەواو و بێ وێنە بۆ وڵات بایەخی هەبێ، دەتوانی لەمەڕ کاریگەرییەکەی لەسەر هونەری شیعر بەشك بی. هەر چۆنێك بێ بە سەرنج دان بە بابەتەکانی ڕۆژنامەکان، لە ئیتالیا پەرۆشیەکی تایبەت لە هەمبەر چیرۆکنووسینەوە هەیە. زانستگاییەکان دانیشتنێکیان بە مەبەستی«بەرەو پێش بردنی ڕۆمانی ئیتالیایی» بەڕێوە برد. پیاوانی بەناوبانگ لە بنەماڵە سەربەدەرەوەکان، یان پیاوانی سەربەدەرەوە لە کاروباری ماڵیدا، پیشەسازی، یان دام ودەزگا فاشیستیەکان، چەند ڕۆژ لەمەوبەر لەدەوری یەك کۆ بوونەوە و لەم بوارەدا قسانیان کرد، و تێلگرافێکیان بۆ دۆچێ نارد و هیوایان خواست کە«سەردەمانی فاشیست بەم زووانە شاعیری شیاوی ئەم سەردەمانە بەدی دەهێنێت. هەمومان دەتوانین لەم ئاواتە مەزنەدا بەشدار بین، بەڵام ئەوە هەر نابێ، کە شیعر بتوانێ لە ماشێنی جوجە کەشیەوە بێتە دەر. شیعر دەبێ دایکی هەبێ، هەر وەها باوکیش. ترسی ئەوە دێتە ئاراوە، کەشیعری فاشیستی ئاوڵەمەیەکی ناسکی لەبار چووی گچکە و ترسناك بێ، لەوانەی وا لە قوتوە شووشەکانی مۆزەی شارە چکۆلەکاندا دەیانبینین. دەڵێن ئەم دێوەزمانە زۆر تەمەن نابەنە سەر. تا ئێستە کەس نەیدیوە

163- Sir Walter Raleigh

ئاژەڵێکی سەیر و سەمەرەی وا لە مەزرایەك خەریکی لەوەڕان بێت. دوو سەر لەسەر لەشێك نابێتە هۆی تەمەن درێژی.

بەم حاڵەشەوە، ئەگەر پێداگری لەسەر دیتنەوەی خەتابار بکەین، لەمەڕ هەمووی ئەم پرسانە خەتا هەر ناکەوێتە سەر شانی ڕەگەزێك. گشت فریودەران و چاکسازان بەرپرسن: خاتوو بێزبێرا کاتێ درۆی بە لۆرد گرانویل گوت کاتێ خاتوو دەیویست حەقیقەتی بە ئاغای گرێگ وت"[١٦٤]". هەموو ئەو کەسانەی وا ئەم بارودۆخی ئاگاداری لە جنسیەتەیان پێك هێناوە خەتابارن ئەوانەن وا کاتێ دەمهەوێ زەینم لەسەر کتێبێك ڕاگرم و لەو سەردەمانەی خۆشی و کامەرانی، بەر لەدایك بوونی خاتوو دەیویس و خاتوو کلۆ، بەدوویدا بگەڕێم، بەرەو پێشەوە پاڵم پێوە دەنێن-لەو کاتەدا وا نووسەر لە هەر دوو پاڵووی زەینی خۆی بە قەرایەك کەڵك وەردەگرێ. کەواتە دەبێ بگەڕێیەوە سەر شێکسپیر، چون شێکسپیر نێرەمووك بوو و هەروەها کیتس و ئێستێرن و کوپێر و لەمب و کولریج. پێموا شێللی بێ لایەن بوو. لە میلتۆن و بێن جانسۆندا پیاوەتی تۆزێ زاڵ بوو. هەروەها لە وردزۆرت و تۆلستۆیدا. لەسەردەمی ئێمەدا، پرۆست تەواو نەنێر نە مێ بوو، تەنانەت ڕەنگە لایەنی ژنایەتیەکەی نەختێ زیاتر بوو. بەڵام ئەم عەیبە هێندە دەگمەنە، کە ناکرێ سکاڵایەکی لێبکەی، چون بێ تێکەڵاوێکی لەم جۆرە، وادیارە عەقڵ زاڵ دەبێ و هێزەکانی تری زەین وشك و نەزۆك دەبن. ئاواش، دڵخۆشی خۆمم بەم فکرە داوە کە ڕەنگە ئەمە قۆناغێکە، کە تێدەپەڕێ زۆربەی ئەوەی بۆ لەسەر بەڵێنەکەی خۆم ماوم کوتومە-بەڵێنی ئەوەی کە ئێوە لە ڕەوتی فیکرەکانم ئاگادارتان کەم-کۆن وەبەر چاو دێت زۆربەی ئەو شتانەی گرپیان بەرداوەتە چاوی من، بۆ ئێوە وا هێشتا عازەب نەبوون جێگەی گومان لێکردنە.

کەچی ئاواش، بەرەو لای مێزی نووسینەکە چووم و دەستم دا ئەو لاپەڕەیەی وا سەردێڕی ژن و چیرۆك لە لاسەرووەکەی نووسرابوو و لەبەر خۆمەوە وتم، یەکەمین ڕستەیەکی وا لەو لاپەڕەیەدا دەینووسین ئەوەیە وا بۆ ئەو کەسەی کە دەنووسێ بیرکردنەوە سەبارەت بە ڕەگەزی خۆت وێرانکەرە.

---

١٦٤- وۆڵف لە ١٩٢٧ لە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر کتێبی ئێمیلی دەیویس و کۆلێژی گێرتەن نووسراوەی باربارا ئێستیوێن ئاماژەی کرد بە وتارێکی گرێگ بەسەر دێڕی«بۆ چی ژنان زیادین؟»«ئاغای گرێگ لەسەر ئەو بڕوایەیە گشت بوونی ژنان لەوەدا کورت دەکرێتەوە کە لەژێر چاوەدێری پیاواندان و خزمەتی پیاوان دەکەن."وادیارە وۆڵف قسەکان و کردەوەکانی ئێمیلی دەیویس لە ڕووبەڕووی ڕایەکەی ئاغای گرێگ دا دادەنێ. و. ف

ژن بوون یان پیاو بوون به جۆرێکی ڕووت و ڕەبەن و پەتی وێرانکەرە دەبێ ژنانە-پیاوانە یان پیاوانە- ژنانە بی. بچووکترین پێداگرییەك لەسەر هەر چەشنە زۆرلێکردن و چەوساندنەوەیەك وێرانکەرە تەنانەت نابێ لە ڕووی ئینساف و یەکسانییەوە بەرگری لە ئارمانجێك بکات یان بە شێوەیەکی ئاگادارانە وەك ژنێك قسان بکات. مەبەستی من لە هێنانە گۆڕێی وشەی«وێرانکەر»گەمە کردن بە وشەکان نییە هەر شتێکی بەو دەمارگرژیە ئاگادارانەیەوە بنووسرێ مردنی بەسەردا دادەسەپێ. ناتوانێ بەر بێنێ. هەرچەندەش بۆ یەك دوو ڕۆژان زیرەکانە و کاریگەر، بەدەسەلات و بە هێز بێتە بەرچاو هەر کە شەو داهات دەبێ بکوژێتەوە ناتوانێ لە زەینی ئەوانیتردا گەشە بکات. بەر لەوەی کە کاری داهێنانە بگاتە بەر دەبێ لە زەیندا جۆرە ئاڵ و گۆڕ و هاوکارییەك لە نێوان ژن و پیاودا بێتە دی. پێویستە چەشنە پێوەندێکی لە ناو دژبەیەکاندا ساز بکرێت. ئەگەر بڕیارە وا هەست بکەین، کە نووسەر ئێمە لە گشت ئەزموونەکانی خۆی دەگەیێنێ، گشتی زەین دەبێ تەواوکراوە بێ. دەبێ ئازادی لە گۆڕێدا بێ و هەر وەها ئاسوودەیی. نابێ هیچ تەگەرێك جیرە جیر بکات، هیچ چرایەك نابێ پرتەپرت بکات. پەردەکان دەبێ دادرابێتنەوە. بیرم کردەوە کاتێك ئەزموونی نووسەر دەگاتە کۆتایی، دەبێ پاڵ بداتەوە و لێگەڕێ تاوەك زەینی جەژنی جووت بوونەکەی خۆی لە تاریکاییدا بگرێ. نابێ چاو لەو شتە کات وا دەکرێ یان لێی بەشك بێت. لە جیاتی ئەوە، دەبێ گوڵەباخێك هەڵوەرێنێ یان چاو لە قورینگەکان کات وا بە هێوری بەسەر چۆمیەوە دەڕون. جارێکی تر ئەو ڕووبارە چکۆلەیە هاتەوە بەر چاوم وا گەمیەکە و خوێندکارەکە و گەلا وشکەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد لە دوورەوە، دەنگەدەنگی هاتوچۆی لەندەنم لەناو ئەو ڕووبارە گەورەیەدا دەبیست و وەبیر ئەو تاکسیە کەوتمەوە وا ئەو ژن و پیاوەی، کە لەو شەقامە بە یەکتری گەیشتبوون، لەگەڵ خۆی بردبوو و لەبەر خۆمەوە وتم، گەریانی ژیان ئەوانی لەگەڵ خۆی برد.

لێرادا، مێری بیتۆن لە قسەکردن دەکەوێت. ئەو پێی گوتون چلۆن بەم ئاکامە گەیشتووە-بەم ئاکامە ڕەق و تەق و وەلانراوە-وا بۆ هۆنینەوەی هۆنراوە و نووسینی چیرۆك پێویستە پێنسەد پاوەندت لە ساڵدا و ژوورێکت هەبێ کە قوڵفێك بە درگاکەیەوە بێ. هەوڵی داوە ئەو بیرۆکە و هەستانەی بوونە هۆی ئەوەی کە بە ئاوەها ئاکامێك بگات ڕوون و ئاشکرا پێتان پیشان دات. داوای لێ کردوون بە دوویدا بچن وا بەرەو لێپرسراوی چاوەدێریەتی هەڵدێ، لێرا نانی نیوەڕۆ دەخوات، لەوێ شیوی شەوێ دەخوات، لە مۆزەخانەی بەریتانیا چەند وێنەیەك دەکێشێتەوە، لە قەفەسەی کتێبەکە کتێب هەڵدەگرێ، و لە پەنجەرەکەوە چاو لە دەرێ دەکات. هەر لەو کاتەدا وا ئەو سەرقاڵی ئەم کارانە بووە، بێ گومان ئێوە بینەری لە ڕێ لادان و بە هەڵە چوونەکانیدا بوون و

سەرنجتان بەوە داوە چ کاریگەرییەکی لە سەر بیروڕاکانی داناوە. حەتمەن هەندێ جار ڕایەکانیتان ڕەت کردوەتەوەیان، بە لەبەر چاو گرتنی ڕای خۆتان، شتێکتان لەسەر داناوە یان لێتان کەم کردووەتەوە. گشتی ئەمانە هەر بەو جۆرەیە کە دەبێ ببێ، چون لە ئاوەها پرسێکدا حەقیقەت هەر بە لەپەنا یەك دانانی هەڵەی جۆراوجۆر پێك دێت. ئێستەکە من قسەکەی خۆم بە پێشبینیکردنی دوو ڕەخنەی زۆر ڕوون دەبڕمەوە، هێندە ڕوون کە لەوە دەچێ بەبێ ئیختیار بێنە سەر زار.

ڕەنگە بڵێن هیچ ڕایەك لە بواری هەڵسەنگاندنی بایەخەکانی دوو ڕەگەزەکە لە لایەن نووسەرەوە دەرنەبڕاوە. لەم کارەدا قەستێك لە گۆڕێدا بووە، لەبەروەی تەنانەت ئەگەر کاتی ئەم بایەخ بڕینەوەیەش ببوایە-لە ئێستەدا، زۆر گرنگە کە بزانین ژنان چەندەیان پوڵ و چەندەیان ژوور لەبەر دەستدا بووە تاوەك لەمەڕ توانابییەکانیانەوە خەریکی بیروڕا دەربڕین بین-تەنانەت ئەگەر کاتیشی گەیبێ، بە ڕای من ناکرێ لێهاتوویی و تایبەتمەندیە زەینی یان تاکە کەسیەکان وەك شەکر و ڕۆنەکەرە بکێشیت ئەم کارە تەنانەت لە کەمبریجیش ناکرێ وا بۆ دانانی مرۆڤەکان لە پۆلەکان و دانانی کڵاوێك لەسەر سەر و پیتگەلێك بەدووی ناوەکانیانەوە هێندە ساز و ئامادەن. بە ڕای من، تەنانەت خشتەی یەکەمینییەکانی ڕۆژژمێری ویکتەریش ناتوانێ پێکهاتەی یەکجاری بایەخەکان بنوێنێ، و هیچ هۆیەکی مەنتقی و ماقوولانە نییە، کەپێمان وابێ سەرپەل بات"[١٦٥]"دەبێ لەدواوەی فلانە وەستاکارانەی سەرشێتەوە بێتە سەر مێزی شیوی شەو. دانانی ڕەگەزێك لە بەرامبەری ڕەگەزەکەی تر، و تایبەتمەندیەك لە بەرامبەر تایبەتمەندیەکی تردا، و بەگەورە زانینی خۆت و بەکەم زانینی ئەوانیتر، تایبەتە بە قۆناغێك لە ژیانی مرۆڤ کە پێوەندی هەیە بە فێرگەی تایبەتیەوە. لەم قۆناغەدا، «دوو لایەن» هەن و لایەنێك دەبێ لایەنەکەی تر ببەزێنێت و ڕاوەستان لە پێگەی شانازی و وەرگرتنی گوڵدانێکی جوانکیلە لە دەستی خودی بەرپرسی فێرگە لەڕادەبەدەر گرنگە. مرۆڤەکان وردە وردە باڵغ دەبن و باوەڕیان بەو دوو لایەنە یان بەرپرسی فێرگە یان گوڵدانی جوانکیلانەکە نامێنێ. هەر چۆنێك بێ، ئەوندەی پێوەندی بە کتێبەوە هەبێ، زۆر ئەستەمە کە ئاوەها نیشانەیەکی بایەخیانەی دیاریکراو و نەگۆڕ بە کتێبەوە بنێی. ئایا ڕەخنەکانی ئەدەبیاتی ڕۆژ بەڵگەیەکی هەتا هەتایی ئەم کێشەیە لە دادوەریکردن و هەڵسەنگاندندا نین؟ ڕێکەوەندگەلێکی وەك «ئەم کتێبە مەزنە» و «ئەم کتێبەبێ بایەخە» کتێبێك دەگرێتە خۆ. پێدا هەڵگوتن و ڕەخنەلێگرتن هەردووکیان قۆڕن. نا، هەرچەندەش پێوانەکردن خۆخلافاندنێکی سەرنجڕاکێش بێ، لە

---

165- Bath

کاره هەرە بێسوودەکانە، و سەر دانواندن بۆ یاساکانی ئەم پێوەرانە سووکترین جۆری بۆچوون و وەرگرتنە. تا ئەو دەمەی وا ئەو شتەی پێتان خۆشە دەینووسن، هیچ شتێکی تر گرینگ نییە و کەس ناتوانێ بڵێ ئەو شتەی دەینووسن هەتا ساڵەهای ساڵ بایەخی دەبێ یان هەر تا چەند کاتژمێر. بەڵام قوربانیکردنی تاڵە موویەکی خەیاڵی ئێوە، یان تاپۆیەکی ڕەنگەکەی، لەبەر حورمەت ڕاگرتنی سەرۆکی فێرگە وا گوڵدانێکی زێوی بەدەستەوەیە، یان ئوستادێك وا هێڵ کێشێکی پێوانەکردنی لەباڵدایە، چرووکترین جۆری خیانەتپێکردنە، و بە بەراوردکردنی لەگەڵ بە قوربانیکردنی ماڵ و سامانی داوێن پاکی، وا سەردەمانێك دەیانوت گەورەترین لێقەومانە، هەر هیچ نییە.

پێموایە ڕەخنەی دواتری ئێوە ئەمە بێ وا من لە سەر لەبەری ئەم قسانەدا بۆ شتە مادیەکان لەڕادەبەدەرم بایەخ داناوە. تەنانەت ئەگەر قسەکانی من تا ڕادەیەکی زۆر وەك سەمبولیست دابنێن-کە پێنسەد پاوەند لە ساڵدا بە واتای کەڵك وەرگرتن لە هێزی تێڕامان، و قوفڵێك بەسەر دەرکەوە بە واتای هەبوونی سەربەخۆیی فیکریە-دیسان لەوانەیە بڵێن زەین دەبێ لەوبەری شتێکی ئاوەهاوە بێ و زۆربەی کەڵە شاعیران پیاوانێکی هەژار بوون. کەوابێ ئیزنم پێبدەن قسەی ئوستادی ئەدەبیاتەکەی خۆتانتان بۆ بگێڕمەوە، وا باشتر لە من دەزانێ چ شتگەلێك کاریگەریان بە سەر سەرکەوتوویی شاعیرەوە هەیە. جەنابی ئارتور کوئیلێر-کووچ دەنووسێت:" [١٦٦]«کەڵە شاعیرانی ئەم سەد ساڵەی دوایی چ کەسانێك بوون؟ کولریج، وردزورت، بایرون، شێلی، لەندێر، کیتس، تنیسۆن، براونینگ، ئارنۆلد، موریس، رۆزێتی، سوئینبێرن-دەتوانین ئالێرا ڕاوەستین. هەموو ئەمانە، جگە لە کیتس، براونینگ و رۆزێتی، خوێنەواری ئاکادێمیکیان هەبووە و لەو سیانەش، کیتس، کە جوانەمەرگ بوو، تاقە کەسێك بوو وا بارودۆخێکی ماڵی باشی نەبوو. ڕەنگە ئەم قسەیە بێ ڕوحمانە بێتە بەر چاو، و حەتمەن خەمهێنەریشە بەڵام ڕاستەقینەی ناخۆش ئەوەیە وا ئەو بیرۆکەیەی دەڵێ لێهاتوویی شاعیرانە لە هەر جێیەکی پێی خوش بێ، بە یەك ڕادە لە نێو هەژار و دەوڵەمەندا، دەر دەکەوێت، زۆر لە حەقیقەت ناچێ. ڕاستەقینە ئەوەیە وا نۆ کەس لەو دوازدە کەسە خوێنەواری ئاکادێمیکیان هەبووە بە واتایەکی تر، بە جۆرێك گەیشتبوونە باشترین پلەی خوێندەوارییەك کە لە ئینگلیستان دەستت پێی ڕادەگەیشت. ڕاستەقینە ئەوەیە وا لە سێ کەسەکەی تر براونینگ، هەروەکی دەزانن، بارودۆخێکی ماڵی باشی هەبوو، و من بە غیرەتەوە

166- Sir Arthur Quiller-Coach,The Art of Writing

پێتان دەڵێم ئەگەر بارودۆخی ماڵی باش نەبوایە، نەیدەتوانی سال"[١٦٧]" یان ئەنگوستیلە و کتێب"[١٦٨]" بنووسێت هەر بەو جۆرەی کە ئەگەر بابی ڕاسکین لە سەودا و مامەڵەکانیدا سەر نەکەوتایە، ڕاسکینیش نەیدەتوانی نگارکێشانی مۆدێرن"[١٦٩]"کۆ بکاتەوە و بنووسێ. رۆزێتی نەختە داهاتێکی تاکەکەسی بوو، بێجگە لەوە نیگارکێشیشی دەکرد تاقە کیتس دەمێنێتەوە وا ئاتروپوس"[١٧٠]" لە لاویدا فەوتاندی، هەر بەو جۆرەی جان کلێر"[١٧١]"ی لە نەخۆشخانەی دەروونی و جێمز تامسۆن"[١٧٢]"ی بە تلیاك لەناو برد. ئەمانە ڕاستەقینەگەلێکی ترسهێنەرە، بەڵام ڕێم پێبدەن لەگەڵیان ڕووبەڕوو بینەوە. لەم بارەیەوە گومانێکی تێدا نییە-هەر چەندە بۆ ئێمە وەك نەتەوەیەك شەرم هێنەر بێ- کە لەبەر کەموکووڕیەك لە کۆمەڵگەی ئێمەدا شاعیری هەژار نە ئێستەکە و نە دوو سەد ساڵیش لەمەوبەر هیچ بەختێکی پێنەدراوە. بڕوا بکەن —ئەوەش بلێم کە من لەم دە ساڵەی دووایییدا بەشێکی هەرە زۆری کاتی خۆم بو بینینی سێسەد و بیست فێرگەی سەرەتایی تەرخان کردووە-ڕەنگە ئێمە بتوانین لافی دێموکڕاسی لێبدەین، بەڵام، لە ڕاستیدا، هیوای ڕزگاری و گەیشتن بەو سەربەخۆییە فیکریە وا بەرهەمی گەورەی لێوە وەدەر دەکەوێت بۆ منداڵێکی هەژار لە ئینگلیستان تاقە تۆزقاڵێك پترە لە کوڕی کۆیلەیەکی ئاتێنی.

کەس نەیدەتوانی پرسەکە لەمە ساناتر بخاتە بەر باس. «شاعیری هەژار نە ئەمڕۆکە و نە لەو دوو سەد ساڵەی دواییدا بچوکترین بەختی نەبووە... هیوای ڕزگاری و گەیشتن بەو سەربەخۆییە فیکریەی وا بەرهەمی گەورەی لێوە وەدەر دەکەوێت، بۆ منداڵێکی هەژار لە ئینگلیستان هەر تۆزقاڵێك پترە لە کوڕی کۆیلەیەکی ئاتێنی. پرسەکە هەر ئەمەیە. سەربەخۆیی فیکری بەندە بە هۆگەلی مادیەوە. شیعر بەندە بە سەربەخۆیی فیکریەوە. و ژنان هەموو کات هەژار بوونە، نەك هەر لەم دوو سەد ساڵەی دواییدا، بەڵکو لە سەرەتای مێژووەوە. ژنان، بە بەراوردکردنیان لەگەڵ کوڕانی کۆیلە ئاتێنییەکان، سەربەخۆییەکی فیکری کەمتریان هەبووە. کەوابێ ژنان بچووکترین بەختیان بۆ گوتنی شیعر نەبووە. هەر لەبەر ئەوەیە من هێندە لەسەر پوڵ و ژوورێك بۆ خۆ پێداگری

167- Saul
168- The Ring and the Book
169- ModErn Painters
١٧٠- Atropos، یەکێکە لە سێدانە ئیلاهەکەی چارەنووس(کلۆتۆ، لاخسیس و ئاتروپوس)لە ئەفسانەگەلی یونانیدا وا سەرەداوی تەمەنی مرۆڤیان بەدەستەوەیە و ئاتروپوس دەیپچڕێنێ. -و-ف
171- John Clare
172- James Thomson

دەکەم. ئاواش، لەبەر ڕەنجکێشانەکانی ئەم ژنە گومناوانەی ڕابردووە، کە ئاواتەخوازم زانیاریگەلێکی زۆرترمان سەبارەت بەوان لەبەر دەستدا بووایە، و لەو پەڕی سەرسووڕماویدا، لەبەر دوو دانە شەڕ، شەڕی کەریمیێ وا فلۆرانس نایتینگێلی لە ژووری دانیشتنی ماڵەکەی هێنایە دەر، و شەڕی ئەورووپا وا دەوروبەری شەست ساڵ دواتر دەرکەکانی لەسەر ژنی ئاسایی کردەوە، ئەم دزێوی و چەپەڵیانە بەرەو باشی دەڕۆن. ئەگەر وا نەبوایە، ئێوە ئەم شەو لێرا نەدەبوون، و ئەگەری ئەوەی کە ساڵی پێنسەد پاوەندتان داهات هەبێ، هەر چەندەش دەترسم هێشتاکەش شتی وا هەر نەبێ، لەڕادەبەدەر کەم بوو.

ڕەنگە هێشتاش هەر گلەییتان هەبێ و بڵێن بۆ ئەوندە گرنگایەتی دەدەی بە نووسینی کتێب بە قەڵەمی ژنان، لە کاتێکدا دان بەوەدا دەنێی ئەم کارە هەوڵێکی یەکجار زۆری پێویستە، و لەوانەیە بکێشرێتە سەر کوژرانی پووری بنیادەم بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی ئەوەی درەنگ بگەینە سەر خواردنی نیوەڕۆ، و ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی لەگەڵ ئاغایانێکی زۆر نازدار تووشی دەمەقرەی زۆر شێلگیرانە ببین. ئیجازەم بدەنێ دان بەوەدا بنێم، کە کەڵکەڵەکانی من تا ڕادەیەك خۆپەسندانەن. منیش، وەك زۆربەی ژنانی ئینگلیسی نەخوێندەوار، خوێندنەوەم پێخۆشە- پێم خۆشە کتێب زۆر بخوێنمەوە. بەینێکە ئەو شتانەی دەیانخوێنمەوە هەندێك وەڕەزکەر بوون مێژوو لەڕادەبەدەر باسی شەڕ دەکات، و ژیاننامە لەڕادەبەدەر باسی گەورە پیاوان وای بۆ دەچم شیعر بەرەو بێ کەڵکی نەزۆکی دادەگەڕێ، و چیرۆك- بەڵام ئیتر بەقەرا پێویست کەم وکوڕیەکانی خۆم وەك ڕەخنەگری چیرۆکی نوێ خستوەتە بەر چاو و لەمە زیاتر باسی ناکەم. کەواتە داواتان لێ دەکەم گشت جۆرە کتێبێك بنووسن، و سەبارەت بە هیچ بابەتێك، هەر چەندەش بێ بایەخ و وەلانراو یان گرینگ، دوو دڵ مەبن. هیوادارم، هەر چۆنێکی بێ، ئەوندە پوڵ پەیدا بکەن کە بتوانن بگەڕێن و دونیا ببینن، سەبارەت بە داهاتوو یان ڕابردووی جیهان تێبفکرن، سەبارەت بە کتێبەکان خەیاڵات بکەن و بەم لا و ئەولای شەقامدا بسووڕێنەوە و لێگەڕێن داوی ماسیگرتنی فیکرتان بچێتە ناو قووڵایی چەمەوە. لەبەر وەی من بە هیچ چەشنێك ئێوە بە چیرۆکەوە نابەستمەوە. ئەگەر دەتانهەوێت من —و هەزارانی دیکەی وەك من- سەرقاڵ کەن، سەفەرنامە و کتێبی تەژی لە بەسەرهات بنووسن، و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە، و مێژوو و ژیاننامە، ڕەخنە و فەلسەفە و زانست. بەمجۆرە، حەتمەن خزمەتی هونەری چیرۆك نووسی دەکەن. چون کتێبەکان بە جۆرێك کاریگەریان بەسەر یەکەوە دەبێ. بۆ چیروك زۆر باشترە وا شان بە شانی شیعر و فەلسەفە هەنگاو بنێت. جگە لەوە، ئەگەر هەر کام لە کەسایەتیە گەورەکانی ڕابردوو لەبەر

چاو گرن، وەك سافۆ"[173]" یان خاتوو موراساکی"[174]" یان ئیمیلی برۆنتێ، دەبینن هەر بەقەرا ئەوەی میراتگرە ئەوندەش ڕەوشتی تازە دادەنێ، و لەبەر ئەوە دروست کراوە، کە ژنان خوویان بەوە گرتووە بە شێوەیەکی ئاسایی بنووسن بۆیە ئاوەها بزووتنەوەیەك لە لایەن ئێوەوە، تەنانەت وەك دەسپێکی هۆنینەوەی هۆنراوە، گرنگ و بایەخدار دەبێ.

بەڵام کاتێك بە یارمەتی ئەم نووسراوانەم بەرەو دواوە دەچم و بیر و بۆچوونەکانی خۆم دەخەمە بەر ڕەخنە، دەبینم کەڵکەڵەکانم هەر خۆپەسەندانە نەبووە. لە نێوانی گشت ئەم بیروڕادەربڕین و دەمەتەقێیانەوە، باوەڕێك-یان ڕەنگە هەستێکی غەریزی؟ -شاردراوەتەوە کە کتێبە باشەکان باش و خواستراون و نووسەرە باشەکان، تەنانەت ئەگەر سەرچاوەی ئاژاوەی جۆراوجۆر بن، دیسانیش مرۆڤێکی باشن. لەم لسۆنگەیەوە، کاتێ داواتان لێ دەکەم کتێبی زۆرتر بنووسن، ئێوە بەرەو کارێك دنە دەدەم کە هەم بە قازانجی خۆتانە و هەمیش بە قازانجی دونیایە. نازانم چۆن دەبێ ئەم هەستە غەریزیە بسەلمێنم، چون ئەگەر کەسێك خوێنەواری ئاکادیمیکی نەبێ، وشەگەلی فەلسەفی ئەو تواناییەیان هەیە، کە بە لاڕێیدا بەرن. مەبەست لە «ڕاستەقینە»چیە، وادیارە شتێکە زۆر تێکەڵ وپێکەڵ و باوەڕ پێنەکراو-وا جارجارەیەك لە جادەیەکی خۆڵیدا دەبیندرێتەوە، سەردەمێك لە لەتە ڕۆژنامەیەکی لەسەر شەقام، و جاری وایە لە گوڵە نێرگسێکی بەر هەتاودا. ڕاستەقینە کۆمەڵێك لە ژوورێکدا ئاگادار دەکات و قسەیەکی ئاسایی زۆر چاك دەسەلمێنێ. کاتێ لە بن ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەدا بە پیاسە بەرەو ماڵەوە دەڕۆنەوە، ڕاستەقینە دەتانگرێتە خۆ و دونیای بێدەنگی لە دونیای کەلام زیاتر وەڕاست دەگەڕێنێ-وە پاشان دیسانەوە لە هاتوهاواری گۆڕەپانی پیکادلی لە ئوتوبوسێکدا وەدەر دەکەوێت. هەندێ جاریش دەڵێی لە قەبارەی وادا وەدەر دەکەوێت کە زۆرمان لێ دوورن و ناتوانین چیەتیەکەیان لێك بکەینەوە. بەڵام لە هەر چیەك بکەوێت، ڕاوەستاو و هەمیشەیی دەکات. ئەمە ئەو شتەیە وا کاتێ تۆخی ڕوژ وەلا دەچێت دەمێنێتەوە لە زەمانی ڕابردوو و عیشق و نفرەتەکانمان هەر ئەوەی لێ دەمێنێتەوە. بەڵام پێموایە نووسەر، لەوانەیە زیاتر لە مرۆڤەکانی دی لە بەردەم ئەم ڕاستەقینەیەدا بژی. کاری ئەو ئەوەیە، کە بیدۆزێتەوە، کۆی کاتەوە و بۆ باقیمانی ڕاگوێزێت. لانی کەم ئەمە ئەم شتەیە وا من بە خوێندنەوەی لیرشا یان ئێما یان بەدووی زەمانی لەکیس چوو تێیدەگەم. چون لەوە دەچێ خوێندنەوەی ئەم کتێبانە، وەك نەشتەرگەری سەیری گۆڕینی نیسکە، شوێن لەسەر هۆش وهەست

173- Sappho
174- Lady Murasaki

دادەنێ لە پاش ئەم نەشتەر گەریە، دیتنەکەمان باشتر و قوولتر دەبێت دەڵێی پەردەی سەر دونیا لادراوە و ژیانێکی بە هێزتری دراوەتێ. ئەو مرۆڤانەی وا لەگەڵ هەر شتێکی ناڕاستەقینە دوژمنایەتیان هەیە ئێرەیی ورووژێنن و کەسانێك وا ڕاستەقینە، بێ وەی ئاگایان لێ بێ یان گرنگایەتی بدەنێ، بە سەریاندا دەڕووخێ جێگەی بەزیین. کەواتە کاتێك داواتان لێ دەکەم پوڵ وەدەست بێنن و ژوورێکتان بۆ خۆتان هەبێ، لە ڕاستیدا داواتان لێ دەکەم لەبەر دەم ڕاستەقینەدا بژین لەوە دەچێ ژیانیکی پڕ لە جموجۆڵ بێت، چ بتوانین ڕایگوێزین و چ نەتوانین.

دەمویست لێرادا کۆتایی بە قسەکانی خۆم بێنم، بەڵام داب و نەریت وا دەکات کە هەر گوتەبێژیەك بە ئەنجامێك بگات. و دان بەوەدا دەنێن کە ئەو ئەنجامەی ژنان دەکاتە بەردەنگ دەبێ بەتایبەتی مەزن و پایەبەرز بێت. دەبێ تکاتان لێبکەم بەرپرسایەتیەکانی خۆتان وەبیر بێننەوە، پایەبەرزتر و مەعنەویتر بن دەبێ وەبیرتان بخەمەوە، کە بەرپرسایەتیەکی گرانتان بە ئەستۆوەیە، و دەتوانن کاریگەرییەکی گەورەتان بەسەر داهاتووەوە هەبێ. بەڵام وای بۆ دەچم دەکرێ ئەم ئامۆژگاریانە بە دڵنیاییەوە بدەی بە ڕەگەزەکەیتر تا بە دەمپاراویەکی پتر لەوەی کە من لە دەستم دێت بەیانی کات، و بە کردەوەش هەر وای کردووە. کاتێ زەینی خۆم دەپشکنم، هیچ هەستێکی پایەبەرز سەبارەت بە هاودەمی و یەکسانی و کاریگەری دانان بەسەر دونیاوە لە ڕێی مەبەستگەلی مەزندا نابینمەوە. دەمهەوێ بە کورتی و بەڕاشکاوی بڵێم زۆر گرنگە، کە خۆمان بین ونەك هیچ شتێکی تر. ئەگەر دەمزانی چلۆن ئەم قسەیە بە شێوەیەکی مەزنانە بەیان کەم، پێم دەوتن خولیای شوێن دانان لەسەر خەڵکانیتر لە سەرتان بهاونە دەر. و سەبارەت بە خودی پرسەکان بیر بکەنەوە.

سەر شۆڕ کردنەوە بە نێو ڕوژنامە و ڕۆمان و ژیاننامەکاندا جارێکی تر وەبیرم دەهێنێتەوە، کە ئەو دەمەی ژنێك لەگەڵ ژنان قسە دەکات دەبێ قسەیەکی زۆر ناخۆشی لە دڵدا هەبێ. ژنان زۆر لە ژنانی دەکۆڵنەوە. ژنان چاویان بە دیتنی یەکتری هەڵنایەت. ژنان–بەڵام ئایا ئیتر بێزتان لەم وشەیە هەڵناستێ؟ دڵنیا بن کە یەکیان خۆم بێزم لێی هەڵدەستێ. کەوایە ڕێم بدەنێ قەبووڵی کەین گوتارێك وا ژنێك بۆ کومەڵێك لە ژنانی دەخوێنێتەوە دەبێ بە شتێکی زۆر ناخۆش کۆتایی پێ بێت.

بەڵام چلۆن؟ چ شتێکم وەبیر دێتەوە؟ حەقیقەتەکەی ئەوەیە، کە من زۆرتر ژنانم خۆش دەوێت. بە پێچەوانەی باو و نەریت بوونەکەیانم پێخۆشە. وردبینییەکەیانم پێخۆشە. گومناویەکەیانم پێخوشە — بەڵام نابێ ئاوەها درێژەی بدەم. ئەم قەرەوێڵەیە لەوێ–دەڵێن هەر سفرە سڕی خاوێنی

تێدایە، بەڵام نەکا سێر ئارچیباڵد بادکین"[١٧٥]" لە نێویاندا خۆی شاردبێتەوە؟ کەواتە ئیزن بدەن شێلگیرانەتر قسان بکەم. ئایا تا ئێرا لە قسەکانمدا بە ڕادەی پێویست تێبینییەکان و دژایەتی کردنەکانی مرۆڤایتیم بۆ وەگێڕاون؟ بۆتانم گێڕاوەتەوە وا ئاغای ئۆسکار براونینگ چ بیروڕایەکی سووك وچرووکی سەبارەت بە ئێوە هەیە. پێم نیشان داون، کە سەردەمانێك ناپێلئۆن چلۆن سەبارەت بە ئێوەی بیر کردووەتەوە و ئێستەکە موسیولینی چلۆن بیر دەکاتەوە. پاشان، بۆ هەندێکتان وا هەوای چیرۆك نووسینتان لە سەردایە، ڕاسپاردەکەی ڕەخنەگرتانم لەو بارەیەوە بۆ دووپات کردونەتەوە وا کەند و کۆسپەکانی ڕەگەزی خۆتان بە غیرەتەوە قەبوڵ کەن. ئاماژەم بە پرۆفیسۆر ئیکس کردووە و بایەخم داوە بەو ڕایەی ئەو وا ژنان لە باری فیکری و ئەخلاقی و جەستەییەوە لە پیاوان چرووکترن. هەر شتێکی وا بەدەم ئەم پشکنینەوە تووشی هاتووم لەبەر دەستی ئێوەمدا داناوە، و ئەمە تێبینی کۆتاییە-لە ئاغای جان لانگدون دەیویس"[١٧٦]". ئاغای جان لانگدون دەیویس ئەم تێبینییە دەداتە ژنان «کە ئەو دەمەی ئیتر منداڵ بوون پێویست نەبێ، هیچ پێویستێکیش بە ژنان نییە.» هیوادارم ئەم تێبینییەتان لە بیر نەچێتەوە.

چلۆن دەتوانم ئێوە زۆرتر هان بدەم تا وەدووی کار و ژیان کەون؟ لەگەڵ ئێوەمە، ژنانی لاو تکاتان لێ دەکەم سەرنج بدەنێ، چون بە ئەنجام گەیشتنەکە وردە وردە دەست پێدەکات-بە ڕای من، ئێوە بە شێوەیەکی شەرم هێنەر نەزانن. قەت شتێکی گرنگتان نەدۆزیوتەوە و پەردەتان لەسەر شتێکی بایەخدار لا نەداوە. هەرگیز ئیمپراتوریەکتان وەلەرە نەخستووە یان بەڕێوەبەرایەتی سوپایەکتان لە شەڕدا نەکردووە. شانۆنامەکانی شێکسپیر بە قەڵەمی ئێوە نییە، و قەت خۆشی شارستانییەتتان بە گەلێکی کێوی نەناساندووە. چ بیانوویەکتان هەیە؟ دەتوانن زۆر بە ئاسانی شەقام و گۆڕەپان و دارستانەکانی ئەم گۆیە خۆڵینەیە پیشان بدەن وا خەڵکانی سپی و ڕەش و بۆری تێیدا تل دەخۆنەوە، و هەموویان زۆر چاك سەرقاڵی هاتو چۆ و کار و ئەویندارین، و بڵێن ئێمە کارێکی ترمان هەبوو کە دەبوایە بمانکردایە. بەبێ کارکردنی مە ئەو دەریایانە نەدەپێوران و ئەو وڵاتە بە بەروبوومانە بیابیان بوون و ئەو هەزار و شەشسەد و بیست و سێ میلیۆن کەسەی وا بە پێی سەرژوماری لە کاتی ئێستەدا هەن لە داوێنی ئێمە کەوتوونە خوار و لەوانەشە تا شەش حەوتساڵی گەورەمان کردبێتن و شتبێتمانن و بارمان هێنابن، و ئەم کارە، بەلەبەر چاو گرتنی ئەوەی هەندێکیان یاریدەدەریان هەبووە، کاتی پێویست بوو.

---

175- Sir Archibald Bodkin
176- John Langdon Davies,A Short History of Women

حەقیقەتێك لە وڵامەكەی ئێوەدا هەیە-حاشای لیَ ناكەم. بەڵام، ئاواش، دەمهەویَ لە بیرتان بێنمەوە، كە لە ساڵی ١٨٦٦ەوە لە ئینگلیستان لانی كەم دوو كۆلێژ بۆ ژنان داندراوە و لە ساڵی ١٨٨٠ەوە ژنی مێردار بە پێی یاسا مافی خاوەنییەتی هەبوە و لە ساڵی ١٩١٩ یانی ڕێك نۆ ساڵ لەمەوبەر- مافی دەنگدانی پێدراوە. ئیزنم بدەنیَ وەبیرتان بێنمەوە، كە نزیكەی دە ساڵێك دەبیَ دەركەی زۆربەی كارەكانتان بۆ خراوەتە سەر پشت. كاتیَ سەبارەت بەم ئیمتیازە گەورانە و ئەو ماوەیەی وا ژنان كەڵكیان لیَ وەر گرتووە تێبفكرن، و ئەم ڕاستەقینەیە لەبەر چاو گرن وا ئێستەكە نزیكەی دووهەزار ژن دەتوانن لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە زیاتر لە پێنسەد پاوەند لە ساڵدا داهاتیان هەبیَ، قەبووڵی دەكەن، كە ئیتر دەرفەت پێنەدان، ڕاهێنان، هان دان، ئەرخەیانی و پارە بۆ بیانوو نابن. جگە لەمانە، ئابووریزانەكان پێمان دەڵێن، كە خانمی سیتۆن زۆری منداڵ هەبوو. هەڵبەتە ئێوە دەبیَ هەروا منداڵتان ببیَ، بەڵام، بەوجۆرەی ئەوان دەڵێن، دووان و سێان، نەك دە دوازدە دانە.

ئابەجۆرە، بە هێندێك لەو ئارخەیانی و فێركاریانەی ناو كتێبەكان، كە لە بیرتان ماوە بەقەرا پێویست جۆرێكی ترتان لە فێركاری ئەزموون كردوە، و پێموایە تا ڕادەیەك ئێوە لەبەر ئەوە دەنێرنە كۆلێژ، كە ئەو فێركاریانەتان لە بیر بچێتەوە-بەدڵنیاییەوە دەبیَ قۆناغێكی تر لەو كارە زۆر نادیار و زۆر دژوار و زۆر دوور و درێژەی خۆتان دەس پێبكەن. هەزاران قەڵەم حازرن پێتان بڵێن دەبیَ چی بكەن و چ كاریگەرییەكتان دەبێت. دان بەوەدا دەنێم، كە پێشنیارەكەی منیش هەندێك سەیر و سەمەرەیە هەر بۆیەش، پێم باشترە لە قاڵبی چیرۆكدا بەیانی كەم.

لە بەینا بەینی ئەم قسانەدا، پێم گوتن كە شێكسپیر خوشكێكی هەبوو بەڵام لە ناو ژیاننامەی شێكسپیردا بە قەڵەمی سێر سیدنی لی"[١٧٧]" بە دوویدا مەگەڕێن. مەخابن، ئەو بە جوانە مەرگی سەری ناوە و هەرگیز وشەیەكی نەنووسی. و لەو شوێنەی وا ئەمرۆكە ئوتوبوسەكان لێی ڕاوەدەوەستن، لە بڕگای شەقامەكانی كەسێل و ئێلێفەنت، نێژراوە. بەڵام، بە باوەڕی من، ئەو شاعیرەی وا قەت دوو وشەی نەنووسی و لەسەر بڕگەی دوو شەقامان نێژراوە، هێشتاش هەر زیندووە. ئەو لە نێو من و ئێوەدا دەژی، و لە ناو ژنانێكی زۆری تردا وا لەبەر شتنی قاپ و خەواندنی منداڵان ئەمشەو لێرەكانە نین. ئەو زیندووە چون كەڵە شاعیران قەت نامرن بەردەوام هەن و تاقە بە دووی هەلێكدا دەگەڕێن تا دیسان لە شێوەی ئینساندا بێنەوە ناومان. پێموایە ئێوە دەتوانن ئەو هەلەی بدەنیَ. لەبەر وەی، بە باوەڕی من، ئەگەر ئێمە سەدەیەك بژین —مەبەستم ژیانی ئاساییە، واتە ژیانی ڕاستەقینە نەك ژیانی بچوك و بە جیاجیای تاكە كەسی- و هەر

177- Sir Sidney Lee

کامەمان ساڵی پێنسەد پاوەند داهات و ژوورێکمان بۆ خۆمان هەبێ ئەگەر ئازادی و غیرەتی ئەوەمان ببێ وا بیر لە هەر چیەك دەكەینەوە بینووسین ئەگەر تۆزێك لە ژووری دانیشتنی گشتی دوور كەوینەوە و مرۆڤەكان نەك هەر لە پێوەندی لەگەڵ یەكتری بەڵكە لە پێوەندیان لەگەڵ ڕاستەقینە ببین هەروەها ئاسمان و درەختەكان یان هەرشتێك بەو جۆرەی كە هەیە ئەگەر بتوانین لەوبەری شەو لە بانەكەی میلتۆنەوە"[١٧٨]"چاو لێكەین، چون هیچ كەسێك ناتوانێ لەم دیمەنە گەڕێ ئەگەر ڕووبەڕووی ڕاستەقینە ببینەوە، چون ڕاستەقینە ئەوەیە، كە هیچ كەسێك نییە پاڵی پێوە دەین و ئێمە بە تەنیاین و لە ناو دونیای ڕاستەقینەداین نەك هەر دونیای ژنان و پیاوان، بەمجۆرە دەرفەتی پێویستمان دەدرێتێ و شاعیری كۆچكردوو، خوشكی شێكسپیر، ئەو جێگەیەی چەندەها جار پێی چۆڵ كرابوو دەگرێتەوە. و، وەك براكەی خۆی، لە ژیانی شاعیرە گومناوەكانی بەرەی پێش خۆیەوە گیانی دێتەوەبەر و لە دایك دەبێت. بەڵام بێ ئەم لێهاتوویی و تەیاریە، بەبێ ئەم هەوڵ و تەقەلایە لە لایەن ئێمەوە، بەبێ ئەم زەبر وتەمایەی كە كاتێ دیسان لە دایك بووەوە هەلی ژیان و شیعر وتنی بدرێتێ، ناتوانین چاوەڕوانی هاتنەكەی بین، چون كارێكی مەحاڵە. ئاواش، من لەسەر ئەو باوەڕەم ئەگەر لەبەر ئەو كار بكەین و خۆمان هیلاك كەین، دێت، و ئەم كار و كۆششە، تەنانەت بە هەژاری و گومناویش، بایی هیلاك بوون و زەحمەتەكەیەتی.
سەرچاوە: اتاقی از آن خود ترجمەی: صفورا نوربخش انتشارات نیلوفر

---

١٧٨- Miltons bogey، ڕەخنەگران سەبارەت بەم چەمكە ڕایەكانیان ناكۆكە. بە ڕای جین ماركس، مەبەست خودای بەهەشتی لە كیس چووی میلتۆنە. و بە ڕای گیلبێرت و گابێر، وۆڵف بە ئانقەستە لێڵی كردووە تا هەم ئادەم و هەم شەیتان و هەمیش خودی میلتۆن بگرێتەوە. و-ف